بابەت : بیروڕای جیاواز
نووسەر : جەودەت احمد محمد
بەروار : 18ی 7ی 2024
شوێن : کۆمەلگای جەژنیکان، بەحرکە

# ناوەرۆك


1. زیرەکی دەروونی EQ
2. گۆرینی عێراق لە ئاراستەی باشوور
3. بێ ناونیشان
4. گۆرینی کرۆکی دەسەلاتی سیاسی
5. ئاوا بە عەینەکەوە دەبینم
6. سیاسەتی زەوی سوتاندن
7. کوردستانی باشوور لە چاویمندا
8. ڕۆمانی شەڕەف
9. ڕۆمانی شیکاگۆ
10. کەوتنی کۆمپرادۆری سیاسی لە باشوور
11. کورد ناتوانێت ناوبژوانی سیاسی بکات
12. سوراقی چی یە؟
13. کودەتای هەلبژاردن لە هەرێمی باشوور
14. هەرێمی باشوور بەتالە
15. دەرفەتی ئۆتۆنۆمی سیاسی لە هەولێر
16. چۆن یاری سیاسی دکریێت؟
17. سەرهەلدانی شۆرەشی کلتوری دیجیتالی لە نووسیندا
18. سیاسەتی شاراوەی ئەمەریکا
19. پێکدادانی هەولێر بەغدا لە نێوان تورکیا و ئێراندا
20. شۆرەشی ستوون نووسینی ژمارەی لە باشووردا
21. دهۆك لە ناوچەی خۆلەمێشی
22. شۆرەشی نەفتخۆران
23. بالدار لە بیرەوەری مندا
24. چەکی ئەتۆمی لە ئەدەبیاتی کوردیدا

**پێشەکی** ...

"هەرشوێنێك ئاستی رۆشنبیری لاوازبوو، زۆرترین کێشەی ژیانی هەیە"
جەودەت احمد

18ی 7ی 2024
کۆمەڵگای جەژنیکان، بەحرکە

# زیرەکی دەروونی EQ:

**بلۆگەر**: جەودەت احمد
**بابەت**: داهاتووی مرۆڤ
**بەروار**: 14ی نیسان 2024

ئەوانی زیرەکی دەروونیان بەهێزە، دوو کاریگەری ئەرێنی و نەرێنی بەسەر ژینگەدا زاڵە بەهۆی ئەوەی تێگەیشتن و هەلسوکەوت و خوێندنەوەیان لە داهاتووی بەردەوامی رۆژ بە گەرانەوە، بۆمێژووی شوێن و کات و رووداوەکان، دەتوانن کاریگەری (رەفتار و دلسۆزی) بگۆرن کەلە پرۆسەی کارکردن رۆلیان هەیە چونکە کەسانی (ئارام، دلسۆز، میهرەبان، بێ ئاگای)ین.

بەپێچەوانەوە ئەوانەی ژیری دەروونیان لاوازە، بەردەوام کێشەن بۆ بارووددۆخی ناوەخۆی و دەرکی، چونکە ئاستی (بێ ئاگای) لاوازە و کاریگەری بەسەر دەروونی هەیە. لێرەدا (بوون)ی ژیر کەسەکە، دەکەوێتە قۆناغی دوودلی کە هیچ هەلوێستی نابێت بۆ گۆرانکاری ریشەی و بەردەوامی دانی کار، هەرکات لەبارنێت لەکەمترین ماوە دوور دەکەوێتە لە شوێنی کار، کە هەستی ئازادی کەسی و دەروونی و ژیری رزگاردەبێت لە جۆرێك لە کارگێری شوێنی کار و سیستەم و ناوچە و پرۆژەی کارکردنەکە..

ئەوانەی ژیری دەروونیان بەرزە، جۆرێك لە قینە و رووخاندنی پێشهاتەکان دەبینن، کە کاریگەری سیستەمی کارگێری میراتی بەسەر ژیری و جیهانی پێشکەوتن زاڵە، بۆیە لەکاتی کشانەوە لە پرۆسەی کار، شوێنی لەق دەبێت و کاریگەری نەرێنی بەسەر کاردا هەیە.

بۆپرکردنەوەی ئەم بۆشاییە بەرێگای مشەخۆری کرێکاری نارۆشنبیر و گەندە، بۆشای کار پردەکاتەوە تاکو خۆی رزگار بکات لە (تەمەنی سووتاو) واتە بەسەر چوونی تەمەن و نزیکبوونەوەی تەمەنی ناوەراست، قۆناغی برینی(مشاری) ژیان و قورسای ئابووری و ئاژاوەی سیاسی، وەك (تەپۆ) مێشوولە خوێنی دەمژێت لە ژیاری تەمەنی بەهەدەر دەروات، واتە نە کارێکارە، نە پیرە کارە، بەلکو کەسێکی دۆراوی ژیانە، بەهۆی (گەلحۆی) و نەزانینی خۆی، جۆرێك لە دلسۆزی ناژیری بەسەریدا زاڵە و دەبێتە قوربانی پرکردنەوەی بۆشای (کاری جێهێلدراو). لێرە هەموو شتێك دەزانێت بەلام هیچ نازانێت.

ئەوەی بەلای من سەرەنج راکێشە لەم جۆرە شوێنانە جۆرێك لە (دزی) زانیاری هەیە بەناوی پرسیار و دەستی هاوکاری لە بەکارهێنانی (بۆتۆم-قۆچپە)ی بەرنامەکان و ستراتیژی نوێکردنەو دارشتن هەنگاوێکی دۆستایەتی (زمان لوسی) لە نێوان بردنی زانیاری (پیشەی بوون) لەگەل بارودۆخەکە، خۆی دەگونجێنێت تاکو زۆرترین گفتوگۆی سەرنج راکێش و دەمەتەقێ و قۆناغی گەوجاندنی کەسانی (ژیری دەروونی) مسۆگەر بکات و پوختەیەك لە پاشاخانی ئەو (بوونە) دەربخاتە و بیخاتە سەر پیشەی رۆژانەی خۆی.

ژیری دەروونی جۆرێك لە سۆز و رەفتاری نەرم دەنووێنی بەرامبەر بارودۆخەکە، کەسانی تێگەیشتوون دوور لە هەموو شتێك بە(غیرەتن) بەلام جۆرك لە رێزگرتنی یاسای گرێبەستی کۆمەلایەتی و ئاینی دەبێتە هۆی نەرموونی ئارامی رۆح و عقل و جەستە واتە هیچ هۆکارێك نابێتە پالنەری (جەنگی جەستەی)، بەلکو خۆرێبەری وادەکات زیاتر کارامەو تێگەیشتنی هەبێت بۆ کۆمەلگا و کەسەکان، بەتایبەت ئەوانەی دەروونی شڕ و دۆراون لە ژیاری رۆژانە و پرۆسەی کاردا. بۆیە ژیری دەروونی لەناکاو، کۆتای بەگرێبەستی کار دەهێنن و دوور دەکەونەوە لە ژینگە ژەنگاوی کاردا.

**خۆدئاگای:**

جۆرێکە لە کۆبوونەوە وەك (ئەبستراك - قەبارەی فیزیکی)بەرامبەر بەئاوێنە رووبەرێکی تەواو داگیردەکات و ناتوانیت ئەم (ئەبستراکت)ەی ناو ئاوێنە زیندانییە، دەست بەسەری بکەی، بەلام ئاوێنەی دەروونی تۆ بەشێکە لەم تەنە نادیارەی کە لەجەستەی تۆ داگیرکردوە بەسەر تۆ زاڵە. بە کورتی خۆئاگاهی واتە (تێگەیشتن لە دەوروبەر)..

**دۆزینەوەی بۆشای مرۆڤ...**

1- بە یەك ووشە..

2- بە یەك جوولە...

3- بیرکردنەوە...

-دەروونی بەرامبەر دەخوێنیەوە کە قەباری ئەم کەسە، نرخی چەندە؟

**خۆبەڕێوەبەری:**

جۆرێکە لە خۆشگوزەرانی دەروونی و مانەوەی جەستە لە زیندانی (ئایدۆلۆژی و ناسیۆنالیزمی و ئاین و زانست و کۆیلەی مۆدێرن) کە وەك شانازی لەم ژینگەیە دەگوزەرێنێت بۆ ئەوەی پێداویستی قووتی رۆژانە بخاتە چوارچێوەی سەروەری (مەزهەب و پیشە و ناسنامە و نەتەوە و ئایدۆلۆژی) واتە خۆرێبەری جۆرێکە لە کۆنترۆلی دەروونی لە دەرەوەی مرۆڤەکان بەسەری زال دەبێت و دەچێتە ژێرباری کارکردن و مانەوەی ژیان بەناوەی (قسەی بێمانا) جۆرێك لە خۆشاردنەوەی دەروونی لەژێری ئەم بارە قورسەی کە ئەبستراکتە بەسەری زالە بەرامبەر بەو پارە و پۆستە و پیشەیە پێدراوە...

**خۆرێکخستنەوە:**

ژێری دەروونی دەتوانێت خۆی رێکبخاتەوە و ئاگای پێشهاتەکان لەبەرچاو بگرێت، زۆرجار ناچاری ئاینی و نەتەوە و ژینگەی دەبێتە زیندانی ئەم خۆرێکخستنەوەیە بۆیە بەناچاری دەچێتە ژێرباری یاسای ئەم (دەسەلاتە) بەسەری زال دەبێت و پابەندی کارکردن و نوێبوونەوەی پەیوەندی و بەردەوامی دانە. بەکورتی (شکاندنی شعوری ئەسپ بۆ ژێرباری کارکردنە).

**هاندان:**

بەردەوامی ژێری دەروونی پرۆسەی کارکردن ئاسان دەکات چونکە سیفەتی (گورگ)ی تێدایە کەسێکی ئەرێنی و چالاکە لەکارکردن و هەولی مانەوە و گەشەی ناوچەی کارکردنەکە دەدات واتە رێکخستنەوەی کار و پرۆسەی گەشەکردن لە پێشینەی ژێری دەروونی دایە، زۆرجار رێگری و شەکەستە بەلام هۆشاری ئەم ژێرە بەسەر بازنەی گەندەلی و دزی و (سلوکی شل) زالە. واتە چینی گەندەل بەشێکە لە چینی نزم واتە (دز و لەشفرۆش و بکوژ و هەژار و نەخوێندەوار و نەخۆش) بوویتە پارادۆکسی ئەم چینە، لەناو ئاستی بەرزدا.

**بەڕێوەبردنی کۆمەلایەتی:**

تێگەیشتن لە دەروونناسی کۆمەلایەتی هۆکاری ئەوەیە کە پێشهات و دواهات ببێتە بەشێك لە زیرەکی دەروونی لە ژینگەی ژیاری رۆژانەیدا، بۆیە مێژوو و رووداوەکان لە رابردوو دەتوانی مەودای تەمەنی (کۆمپانیا و حکومەت و حیزب و جەماوەر و هەلی کار) دیاری بکەیت چونکە مێژوو لە جەستەی نوێ لەدایك دەبێتە و دووبارە دەبێتەوە لە (شوێن و کات و رووداو)ێکی نادیار.

**بەڕێوەبردنی پەیوەندی:**

هێشتنەوەی پەیوەندی و فراوانکردن لە رێگای دۆزینەوەی کەسی ژیر و نوێبوونەوەی پیشە و ناسینی کلتور و رێکخراو و کۆمپانیا و حکومەت و حیزب، هۆکاری مانەوەو بەردەوامی دانی خۆرێبەری و بەرزبوونەوەی زیرەکی دەروونی یە. بەلام لە چوارچێوەی (کریار و فرۆشیار) مامەلە دەکەیت لە کەسایەتی خۆت و پیشە و پەیوەندی، بەهیچ ئەگەرێکی لۆژیکی ناچیتە ژێرباری دەروونی دەرەکی بەلکو وەك کارگەی پیشەسازی لەسەر خواستی کریار، بەرهەمی رۆژ، بۆ دابین دەکەیت..

**جیاوازی نێوان زیرەکی ژمارەی و دەروونی..**

-زیرەکی IQ واتە دۆزینەوەی بۆشای عقل لە هرز و زانستدا سەرباری هەبوونی کۆگای رۆشنبیری و زیرەکی تەمەنی پیشەی دەبێتە کەسێکی لێهاتوو لە پۆستی کارکردن بەلام ناتوانێت تێگەیشتیان بۆ مرۆڤ هەبێت.

-زیرەکی EQ واتە تێگەیشتن لە هەست و رەفتار و بیرکردنەوە لە رابردووی ئەم (بوون)ە واتە کەسەکە، بەلێهاتووی لە ژێری رۆشنبیری بەهێزترە و توانا و لێهاتووی لەژێر کۆنترۆلی خۆرێبەری بەرێوەدەبات دوور لە تێگەیشتنی پیشە و رۆتیناتی بەرێوەبردنی کار و سیستەم و یاسا و رینمایەکان.

کەواتە کەسی ژیری دەروونی، بەردەوام (دووره پەرێز)ە بەهۆی خۆپاراستن لە کۆمەڵگای شێواو و کەوتنی کۆمپانیا و سیستەم و حکومەت و حیزب و ئاین.

**ئەم گفتوگۆیە هزریە، جۆرێکە لە شیکردنەوەی رۆتیناتی ژیانی رۆژانەمان لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی دووره لە (سیاسەت)، ئێمەی گەنجی پیر، لە دوای رووخانی رژێم، وێڵی ئازادی بیرکردنەوە و ئازادی سیاسی و ئازادی زانستی بووین، بۆیە بە ئەرکێکی ئەخلاقی دەزانم ئەو قوربانیە لەرێگای چەکداری بەخشیمان وەك خوێن، ئێستاش بۆمان هەیە، لە چوارچێوەی ئەم خوێنە بیربکەینەوە بنووسین و بلاوبکەینەوە، دەبیت ئەمەریکا و ناتۆ بە دلێکی گەورە ئەم چینە رۆشنبیرە لەناوەخۆی کوردستانی باشوور و شاری هەولێر بەهەند وەربگرێت و رێزی بگرێت نەوەك سەرکوتی بکات و لەناوی بەرێت...تکا دەکەم ئەگەر بە ئاشتی و دانیشت چارەسەر دبێت، ئامادەم ئەم دانیشتە ئەنجام بدەم....**

# گۆرینی عێراق لە ئاراستەی هەرێمی باشوور

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : داهاتووی مرۆڤ
بەروار : 6ی جوون 2024

بۆئەوەی قۆناغی داهاتووی سیاسی لەناوەخۆی کوردستان لە چوارچێوەی دیموکراسی جێگیربکرێت و کاریگەری ئەرێنی هەبێت بەسەر ئقلیمی و ناوەخۆی عێراق، دەبێت هەنگاوی ئۆپۆزسیۆن، کارا بکات بۆ گۆرینی دەسەلات لە کلاسیك بۆ ئولترامۆدێرن، واتە گەراندنەوەی شکۆی حکومەت لە پێگەی هەولاتیبوون و سەروەری دادگا و پەرلەمان و جێبەجێکردن، ئەم کاتە دۆخی دەسەلاتی سێبەر لە خێزانی حیزب و عەشائیری و بازرگانی و نوخبەی تایبەت دادەپلۆسرێت لە هێزی (قەیوم) گومدەبێت لەناوەخۆی سێکتەری گشتی حکومەت و جەماوەری، بۆیە ئەم هەنگاوە دەبێتە هۆی گەرانەوەی متمانەی دەنگدەر و هەلبژاردنی ئازاد و دوورکەوتنەوە خێزانی کورد لە پێگەی (عەشائیر بۆ نوێکاری خۆشگوزەرانی دەروونی و عقلی و جەستەی). بەمەرجی دابینکردنی هەلی کار و دورخستنەوەی پەنابەران و کرێکاری بیانی یان دانانی باج لە 70% لەسەر دەستی کاری بیانی و پەنابەران بۆ ئەوەی کۆچی ناچاری لەناوەخۆ بەرو ولات بگەرێتەوە، ئەوکات دۆخی هەرێم دەبێتە سەقامگیری سیاسی و ئابووری و سەربازی بەلام لەدوای ئەم قۆناغە هەنگای گشتاندنی خاکی کوردسان بەناوی ئۆتۆنۆمی (ئابووری نیولیبرالی و دیموکراسی و کۆمەنیستی نوێ) لە دوو بەرە، بەلای راست و چەپ بۆئەوەی قۆناغی نوێبوونەوەی ئابووری سیاسی پێش بخات، ئەمە تەنها بۆدورخستنەوەی پێگەی ناسنامەی (سیاسەتی نەتەوەپەرەستی)ە تاکو ئاستی کۆنەپەرستی دابەزێت بۆ دیموکراسی و کۆمەنیستی بازاری ئولترامۆدێرن، واتە سیاسەتی حکومەت لە کلاسیك بۆ ئۆپۆزسیۆن دواتر گۆرینی بەکاربەر بۆ ئابووری ناوەخۆی و جیهانی لە سێبەری (دیموکراسی و کۆمەنیست)، لەبەر ئەوەی هەرێم لە چەقی بازاری (برێکس و ج7) ئەم دوو دژە جەمسەرە، ئەگەر مامەلەی تەندروستی لەگەل نەکرێت دەبێتە هۆی خالی گالتەجاری (جەنگی پرۆکسی جیهانی، لەسەر ئقلمی). بۆیە لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتی و ئاین و پراگماتی بۆ (مەدەنیەت - هاولات)ی بوون، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئابووری مرۆی و کەمی تێچووی سەرمایی حکومەت لە سێکتەری گشتیدا. لێرە تاك رۆلی خۆیدەگێرێت لە پێگەی هاولاتیبوونی نیشتیمانی کوردستان وەك زانست و نوێنەراتی لە ناوەخۆ و جیهاندا، نابێتە هۆکاری ئاژاوەی رەگەزەپەرستی و کێشەی سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆی و ئاینی، بەلکو قۆناغی نەتەوایەتی و ئاینی و کلتوری ریشەکێش دەکات، کوردستان رزگاری دەبێت لەدەستوەردانی مەزهەبی و پێکهاتەی نەتەوەی لە ئاراستەی دیپلۆماسی ئقلیمی و جیهانیدا.

# بێ ناونیشان

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : داهاتووی مرۆڤ
بەروار : 7ی جوون 2024

سیستەمی فیدرالی بۆ کۆکردنەوەی خاك و دەسەلاتە، کەچی لەسایەی دامەزراوەی عێراق لە سالی 2003، بەجارێك عێراق پەرتەوازەبوو لەرووی سیاسی و سەربازی و ئابووری، هەر خێزانێك سوپا و حیزب و میدیا هەیە بەبەرچاوی جیهان، پشتگیری هێزی سێبەر دەکەن بۆمانەوەی خۆیان لە قەواری پیرۆزی (ئاین و خێزان و جوگرافیا)دا، فیدرالی نەیتوانی کۆمەڵگای سیاسی کۆبکاتەوە سەروەری بۆ عێراق و هەرێم دابین بکات چونکە لە ئەزەلەوە لەسەر دەستورێکی کلتوری و مەزهەبی دامەزراوە تاکو بەردەوام هێزی حکومەت بەلاوازی لەناوەندی پەرلەمانی هەمەرەنگ لە کلتور و مەزهەب و نەتەوە بەڕێوەبچێت، ئەم جۆرە سیستەمە گەواهیدەری ئەوەیە کە خاك و ئاو و مرۆڤ و مێژووی شارستانی بابلی بەرەو لاوازی تەمەنی درێژبکرێت و تەنها جیهانی زلهێزان دەرفەتەکان بدۆزنەوە لەسێبەری گروپی (پراگماتی خێزانی) بەناوی (پارتیزانی و مەدەنی و مەزهەبی)دابێت.

وێنەی خۆرئاوای پیر وەك ئەورووپا، هەمان کێشە و سیناریۆی ئەم سەردەمە هەبوو بەلام ریفۆرمکردنی شەقام لە پێگەی (هاولات)بیوون و هەستی ناسیۆنالیزمی نەتەوەی مۆدێرن، بەرێگای کۆکردنەوەی دەنگی چینی دەستی کار و رۆشنفکران و قوتابیان، توانیان دەولەت و حکومەت و حیزب و جەماوەر لە قۆناغی کۆنەپەرستی بۆ جیهانی نوێبوونەوەی پیشەسازی و هزری و ئەدەبی و دبلۆماسی گەشەبکات. ئەم هەنگاوە هۆکاری رزگاربوونی خاك و سەروەری گەلە لە سێبەری سوپای هەوالگری لەناوەخۆی وەلاتەکەیان.

ئێستا لە ناوەخۆی عێراق و هەرێم، جۆرێك لە فۆرمی (کرێکاری چاودێری) بەناوی پیشەو گەشتیار و بازرگانی و رێکخراوی جیهانی و دبلۆماسی و کلتوری لەناوەخۆی عێراق و هەرێم، رەگ وریشەی داکوتاوە بە راست و چەپ کار لەسەر زانیاری کەسی و خێزانی و ئاینی و نەتەوەی دەکرێت بەناوی (پرۆژەی بچووك و هاوکاری مرۆی). ئەمە هۆکاری بۆشای پلانی حیزبەکانە لە پێگەی حکومەت، چونکە هەر کۆلان و شارو دێهاتێك جۆرێك لە (دلسۆزی و رەفتاری و لایەنگری) لەناوەخۆی خێزان و چین و توێژی جیاواز داگیرکردوە و سەرجەمیان کردوونە بە دژی یەکتر لە پێناو مانەوەیان و گەیشتن بە زۆرترین دەسەلات و داهات لە چوارچێوەی مەزهەب و ئاین و خێزان و حیزب و کۆمپانیا و سوپادا، درێژە بە خەباتی پراگماتی خۆیان دەدەن بێگەرانەوە بۆ سەروەری یاسا و پەرلەمان و حکومەت و دەولەت و هەرێم.

کاتێك ئەمەریکایەکان بریاریاندا، 12 کۆلۆنێل لە ئەمەریکا کۆبکەنەوە لە ژێردەستی بەریتانیا رزگاربکەن، لەرێگای ناوەند دەسەلاتی فیدرالی، ولاتەکەی رزگاربکات لە داگیرکاری بەریتانیا بۆیە سەنتەرالیزمی دەسەلات بووەهۆی لەناوبردنی هێزی سێبەر و رووکار. دۆخی ئێستا عێراق و هەرێم بەدەست ئقلیمی و جیهانی گیریخواردوە بەهۆی بەکرێگیراوی حیزبی و خێزانی بەناوی دلسۆزی مێژووی کە رۆژانێك هاوکاری عێراق و هەرێم بووینە لە رووداوەکان. ئەم دەستوەواژەیە ئەوپەری ناهۆشیاری خێزانی کورد و عەرەب و پێکهاتەکان لەناوەخۆ دەسەلاتدا. سیاسەتی دلسۆزی بەرێگای لێدوان و هاوکاری راستەوخۆ و سەردان، جۆرێکە لەرێگا ئاسان بۆدەستوەردان لەناوەخۆی ئەم ولاتەو هەرێمە. ناکرێت بەگێرانەوەی مێژوو وەك سەرنجدانی دلسۆزی، کاریگەری بەسەر رەفتاری ئێمە و زیرەکی دەروونی هەبێت. دەبێت دلرەقانە لە قالبی مانەوەی خاك و نەتەوە و حکومەت و حیزب گۆشەی فراوانتر و نەرمتربگرینە بەر بۆ ئەوەی بە پلانی (هەنگاو بەهەنگاو) بارودۆخی ناوەخۆی عێراق و کوردستان لە هزری تیرۆر زلهێزان بەسەر ناوەخۆی تاکی عێراقی و کوردی دوور بخەینەوە، تاوانی گەنجێکی گەرمیان چی یە لەکاتی گەشتی ئاینی بکرێتە قوربانی جیهانی ئقلیمی بلێن ئەمە تیرۆرستە؟ کێ بەرپرسیارە لە بەفیرۆدانی خوێنی ئەم گەنجە؟ رۆژتا ئێوارە لە ئاسمان و زەوی تەرمتانێی تۆری شاراوەی هەوالگری

بەناو دێهات و شار و دەشت و دەر بلاوبوونەوە، ئەمانە مەترسی دەخەنە سەر ژیانی تاك و ئابووری مرۆی و دواخستنی ژیان لەسێبەری دەستوردان و سنوور بەزێنی هەژمار دەکرێن.

سەرژمێری بەرێگای بایۆمەتری و دیجیتالی لەناوەخۆی عێراق و هەرێم هیچ لە دۆخەکە ناگۆرێت چونکە دەسەلاتی میرنیشینی مەزهەبی و نەتەوەی بەسەر حکومەت زالە، بۆیە سەرجەم کارەکانی حکومەتی بەغدا و هەولێر دەبێتە (خوری). ناهۆشیاری تاك و برسیەتی خێزان و چەوساندنەوەی عەوام بەناوی جیاواز و خوازراو، جۆرێکە لە دەرفەت بۆ پرکردنەوەی بۆشای برسیەتی و هەژاری و ئارەزووی دەروونی، ئەم جۆرە کۆمەلگایە باشترین هەلی جاسوسی بۆدەرخسێت وەك ئامرازی دەستی ناوەخۆی بەسەر حکومەت و حیزب و خێزان و دەولەت و هەرێم زال بکات. قۆناغی پەرلەمان و دادگا دوابخات.

ئەو رووداوە ناوەخۆی عێراق و هەرێم بەرێگای درۆن و تیرۆرکردن و ئیهان و سەرکوتکردن سەرجەمیان کێ بەرپرسە لەم خێزانانە؟ لەم رووداوانە؟

قەبارەی خاکی عێراق و هەرێم بەخۆلەمێشی ناسێندراوە بەگوێری شیکەرەوانی گروپی بیرکردنەوەی (کریس). باس لە راستی ئەم واقعەی هەرێم و ناوەخۆی عێراق دەکات کە حکومەتی هەولێر بەغدا ناتوانن لێکۆلینەوە و لێپێچینەوە لەناوبردن و دەستگیرکردنی ئەم چین و توێژانە بدەن چونکە بەشێکە لە پلانی دەولەتی سێبەر لەناوەخۆی هەرێم و عێراقدا. دەتوانن سەرجەم تاوانی ناوەخۆی کۆنترۆل بکەن بەلام ناتوانن تاوانی هەوالگری دەستی بۆببەن، واتە حکومەت بەرێگای ناوەندی هەوالگری دەبێت سەرجەم کەیسی ئەم کەسە لە پۆستی بازرگانی و سیاسی و سەربازی و میدیا و بلۆگەران و مەدەنی بەرێگای تەلەفۆن و چاودێری دێهات و شار لە پێگەی حیزبی و هاولاتیبوون بخاتەگەر تاکو ئەم داواکراوە بدۆزێتەوە مەرگی مردنی بۆ بەپێشبێخن. و بەرژەوەندی زلهێزان و ئقلیمی بپارێزن بەناوی هاوپەیمانی و دەسەلاتی زلهیزی لەناوچەکەدا.

ئەزانن کاتێك حزبێك، حکومەتێك، کۆمەلگایەك، بۆمانەوەی خۆی و دەسەلاتی، لەبەردەم چاوی ئەوان یاری بەمەرگی تاکی کورد و عەرەب دەکرێت، دەبێت چ جۆرە سەرشۆری و ریسوای دەروونی بێت بۆ مانەوەی خۆیان و رازیکردنی زلهێزان؟ ئەم نووسینە وێنەیەکی خۆم دێتەوە بەرچاو کاتێك ناتۆ و ئەمەریکا لە زەوی و ئاسمان بەدوام بوون بۆلەناوبردن و تەمبێکردنم لەپرۆسەی (Psychological action). ئەوکاتە لەژێر چاودێری درۆن و فرۆکەی هەوالگری بووم، زۆرم پێکەنین بەباروودۆخەکە دەهات. (جەودەت احمد) لە کۆمەلگای جەژنیکان گەیشتە ئەو ئاستە هزرییەی کە کاریگەری نەرێن هەبێت بۆسەر ناتۆ و ئەمەریکا؟ زۆرجار بیرم لەوەی دەکردەوە خەباتی (مەلای) دەنگی خاك زۆرجیاوازە لە خەباتی (شۆرەشی راپەرین و کۆتا سەدەی 20). چونکە خێزانی نوێبوونەوەی خێزانی مەلای لەناوەخۆی جوگرافایی شێواو هەوالگری و سیاسی و دبلۆماسی پێشهاتو دواهاتەکان بەرچاوروونە بۆ ئێمە، کە بیرکردنەوە و تێرامانمان 360 پلە لەگەل پارتی و یەکێتی و مایکرۆ حیزبەکان جیاوازە، ئێمە بە چاوی (هەلۆ) لەئاسمانەوە چاودێری و هەلسەنگاندی ناوەخۆ و دەرەکی دەکەین بۆیە تێرامانی ئێمە لە خێزان و نەوەی مەلای کەلە دایکبووی یەکێتی سۆڤیەتی کۆنە وەك خەباتی (قازی و شێخ محمود و مەلا مستەفا و شێخ سەعید) جۆرێك بوو لە دروستکردنی متمانە بۆمانەوەی کوردستانی گەورە و رزگارکردنی لە دەستی ئقلیمی و زلهێزی، راستە جۆرێك بوو لەگەیشتنی مەزهەبی لینینی کۆن بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست و بەربەستێك بوو لە بەردەم لیبرالی دیموکراسی. ئەوان عێراق و هەرێمیان گۆری بۆ بەکاربەر نەوت و بازاری هاوردەکرا، بەلام سەردەمی سەدەی 20 و تیرۆرکردنی عەبدلکریم قاسم کۆتای بە پیشەسازی عێراق هێندرا و دیوەزمەیەکی (عۆجە) خرا دەسەلات لەبەردەم چاوی پارتیزانی کورد و نەتەوەیەکگرتوەکان و جمسەری دیموکراسی، نەتەوەی کورد خەلتانی خوێن کرا تاکو کورد بگەوجێدرێت بۆ دامەزراندنی دەولەتی کوردی لەرزۆك لەسێبەری جیهانی زایۆنیدا یان لە رووخاندنی صدام حوسێن، ئەم خەونە بووە پووشی پایز. ئێستا یادی ریفراندۆم دەکرێتەوە، ئەم ریفراندۆمە بۆ شکاندنی ترسی خەباتی پارتیزانی راپەرینە لە جەستەی مەکتەب سیاسی ڤێلا و پترۆدۆلار، بەلای فکری مەلای جۆرێکە لە بچووککردنەوەی زەوی باشوور بۆ رازیکردنی هێزی ئقلیمی و زلهێزی، بۆیە بەشەرمەزاریەوە تێرامانمان هەیە بۆ ئەم رۆژەو رووداوە، هەنگاوی سیاسی مەلای لەناوخۆی جەمسەری (نیۆکۆمەنیست و نیۆلیبرالی دیموکراسی) هێشتا ماویەتی بۆ ریفۆرمکردنەوەی ناوەخۆی عێراق و کاریگەری بەسەر دراوسێیان و جیهاندا، ئێمە بیر بەدەرزی لێدەدەین نەوەك بە شۆفل و بروخێت، وێنەی دەنگی خاك، نیشتیمانێکی گەورەیە لە ناوەراستی هێلی مانگای بەپیت و دەولەمەندە لە رۆژهەلاتی ناوەراست و جەمسەری گرێدراوی ئاسیا و ئەورووپا و ئەفریقا. زۆرجار بە ئێمە دەلێن (فگور) چونکە عقلیەتی ئێمە لە گۆشە نیگای (دۆلار و دەسەلات و خێزان )نیە، بەلکو لەمانەوەی باشوور و کوردستانی گەورەیە دوور لە پەرستنی (خەباتی پراگمات بۆ پراگماتیستی).

تێروانینی ئێمە لە گەنج بۆسەرجەم بارودۆخەکان بەگۆشەی جیاوازە، نەدژی ئقلیمی یە نە دژی زلهێزانە بەلکو خۆکۆکردنەوەیە لەسێبەری مێژووی (مەلای دەنگی خاك) دوور لە وێنە و ئالا و گۆرستان بەلکو (کوردستان هی هەموانە لۆ هەمووانە) بەیاسای حکومەتێکی مەدەنیەت لە گۆرینی خەباتی پراگماتی خێزانی رێبەری بۆ سلۆگانی (برایەتی و یەکسانی و کوالێتی) ئەم سلۆگانە هەمان شۆرەشی فەرنسابوو کە لەدەستی دەرەکی و ناوەخۆی و خێزانداری رزگارکرد.

بۆیە قۆناغی عێراق لە رابردوو بۆ داهاتووی بەردەوام و نادیارە جۆرێکە لە شلەژانی سیاسی مەزهەبی و نەتەوەی و کلتوری، کەبۆتە مۆتەکەی سیاسی ناوەخۆی و دەستوەردان ئقلیمی و جیهانگیری لەبەردەم وەستاوەتەوە.

بۆچی بەئازادی نەتوانم سورەتی (کەهف) بخوێنم لەرۆژی هەینی لەمزگەوتدا؟ کەچی بەکرێگیراوی ناوەخۆی و هاوپەیمانی، بەدرۆن و مەدەنیەت لە پیشەی گەشتیار و کرێکار و رێبواری، لەپشتت وەستاون بۆ هەلسەنگاندن و چاودێری خێزانی و کەسی؟ ئەمە قۆناغێکە لە ئێستا بۆداهاتوو لە ئەستۆی هەموو چینی رۆشنبیران و کرێکاران و قوتابیانە لە رەگەزی نێر ومێ شۆرەشێکی هزری مەدەنیەت لەهەموو گۆشەکانی عێراق و کوردستان بچێتە جوولەی نەرم بۆئەوەی لە کۆتای سالانی 30 تا 50 هەرێمێك و دەولەتێکی پیشەسازی مۆدێرنی دیجیتال و ماتریالی نوێ لەدامەزراوەیەکی نیشتیمانی خۆی بەرێوەببات. ئەوکات بەغدا و هەولێر رزگاری دەبێت لە سیاسەتی خێزانی و میراتی و ئاینی و کلتوری. ئەگەرنا هەموو رۆژ، ژیانی ئێمە لە سێبەری درۆن و چاودێری ناوەخۆی و بیانی سەرکوت دەکرێن و هەرچی پرۆژە و داهێنان و ئامانج و داهاتووی هەمانە دەبێتە قوربانی مانەوەی دەستوەرادانی بیانی.

ئەمەرۆکە نەم زانی چۆن نوێژمکردن لە مزگەوت...؟!

# گۆرینی کرۆکی دەسەلاتی سیاسی

بلۆگەر: جەودەت احمد
بابەت: داهاتووی مرۆڤ
بەروار: 8ی جوون 2024

دەسەلاتی سیاسی دامەزراوەی وەك سەرۆك هەرێم و حکومەت و شارەوانی، ئەم دامەزراویە راستەوخۆ بەرێگای زۆرینەی کورسی پەرلەمان نوێ دەبێتەوە لە سێبەری سیاسەتی حیزب. بۆیە کۆمەلگا بەرەو دواوە دەگەرێتەوە بەهۆی گەندەلی و قەیوم و پەککستنی حکومەت لە مەدەنیەت بۆ تاکرەوی و درێژە پێدان.

دەسەلاتی سیاسی حیزبی راستەوخۆ لە پرۆگرامی حیزب دەخرێتە ناو پرۆسەی دامەزراوەی سیاسی حکومەت لێرە بە دەستوەردان و نەبوونی دەستور و درێژکردنەوەی یاسا و حکومەت و داوخستنی پەرلەمان دەبێتە شەرعەیەتی گەرانەوەی دەسەلاتی (خێزانی بۆسەر ئاسایشی هەرێم و حکومەت).

خەباتی پراگمات بۆ پراگماتیست لەرووی مۆدرنێتی هیچ بەهاو نرخی نیە، بەلکو لەجیهانی کاپیتالیستی بەنامۆ هەژماردەکرێت لە جەمسەری نیۆکۆمەنیست و نیۆلیبرالی، واتە خێزانی حیزب و حیزب لە حکومەت، ئامانجی مانەوەی خۆیان لەپێش هەرێم و خاك و خەلکە، هەرچی بەرژەوەندی گشتی بێت لەناوی دەبن بۆ بەرژەوەندی مانەوەی خۆیان.

قوفلدانی ئەم دوو دەسەلاتە دەبێتە مانەوەی نێونەری کەرتی تایبەت و میدیا و ڕێکخراوی ناوەخۆی و ڕێکخستنی جەماوەر لە ئاین و کلتور و نەتەوە. کەواتە شکاندنی ئەم کۆدە، بەرێگای هۆشیار و ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە کە کاربکات لە ئەرشیفی کۆنگرە و مێژوو و گەندەڵی حیزب و حکومەت لە چوارچێوەی هۆشیاری تاك کە (دلسۆزی و ڕەفتاری) لە بەرژەوەندی دژ و هەڵگەڕاوە بۆ قەواری (هاولاتی)بوون دابێت.

ئەوکات پەرلەمان دەبێتە نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵك و حکومەت وە ڕاستەخۆ دەتوانێت دادگا جێگیر بکات بۆ لێپێچینەوەی داهاتی بەهەدەرچوو لە ولاتانی ئەفریقا و ئەوروپا و کەنداوی عەربی و ولاتانی ئەمەریکای لاتینی. وەك دەسەلاتی ئوسترالیا، چۆن سەرجەم داهاتی دزراو وقاچاغ لە دووبەی گەڕاندەوە هەمان پلان دەکرێت بۆ ناوەخۆی هەرێم لە بردنەوەی ئۆپۆزسیۆن بچێتە بواری جێبەجێکردن.

نهێنی مێژووی خەباتی کورد تەنها (ئامانج و ئامرازی جیهانی شاراوەیە) بۆهاتنەناوەی ڕۆژهەلاتی ناوەراست بەلام خێزان و پێگەی حیزب ئامرازێك بوو بۆگەیستن بەم ڕۆژە. چۆن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەڵوەشایەوە لە سێ کیشوەر بۆ تورکیای سەردەم دواتر ئیسلامی عوسمانی نەتەوەی، ئێستا دەبێتە نوێنەری داهاتووی ئەمەریکا. هەمان پلانەی ئەوکات بۆ هەرێمی کوردستانی باشوور بەکارهاتووە.

ئەوەی ژیربێت دەتوانێت ئەم حکومەت و هەرێم و حیزب و مایکرۆ حیزبانە لەم هەڵبژاردنە لوش بکات و سەربکەوێت. زۆرینەی دەنگ بۆ هۆشیاری خەڵك و گۆرینی دلسۆزی و ڕەفتاری دەنگدەرە. ئەگەر ئەم گۆرانکاریە سەری نەگرت ئەوکات جەنگ و ژینگە و دادگای فیدرالی دەتوانێت ریفۆرمی کارگێری حکومەت بکات بەمەرجی لۆبی بەهێز لەناوەخۆی پەلەمانی عێراق و پەیوەندی دەرەکی زلهێزان.

بەگوێری یاسای زانای سیاسی دێڤد ئیستۆن، هەرێمی کوردستان و کۆمەڵگایەکە لە دەرەوەی شەرعەیەت و قەواری عێراقە. چونکە هەموو شتێك بەسەرچووە لەرووی یاسای..

"سیستەمێکی سیاسی بێ یاسا و دامەزراوە؛ ناتوانرێت سیاسییەک هەبێت."

دەیڤید ئیستۆنە

# ئاوا بە عەینەکەوە دەبینم

بلۆگەر : جەودەت احمد

بابەت : داهاتووی مرۆڤ

بەروار : 9ی جوون 2024

ئاژاوەیەك دەكەوێتە ناو حكومەتی هەرێم، بەرێگای فشاری ئەمەریكا بۆسەر بەغدا و جێگیركردنی دەستوور لە هەموو روێكەوە، حكومەتی هەرێم لێ رزگارنابێت، ئەم ئاژاوەیە لەنێوان مووچە و كارمەندانە بەگشتی سەرباری كێشەی كۆكراوەی 20 ساڵەی رابردووی هەرێم، سەرجەمی بەسەر كابینەی 9 دەشكێتەوە چونكە كەڵكبوونی كێشە و عینادی سیاسی و دواخستنی هەڵبژاردن و پەكەوتنی حكومەت لە سەربەخۆی دوور لە حیزب، هۆكاری داشۆرینی دەسەلاتی هەرێمە بەرووی بەغدا و واشنتۆن، ئەزانن بۆ؟ هەتا ئێستا هەرێم و پارتە سیاسییە خێزانیەكان و ماكرۆجەماوەریەكان تێگەیشتنیان بۆ ئەمەریكا و ناتۆ نەبووە، چۆن بە ووردی و شلی فشار زیاد دەكات وەك كردنەوەی شێرە بەلۆعەی ئاوە، بە چۆرە چۆڕ فشار دەخاتەوە. ئەم نیشانانە سەرەتایین، بەهیچ شێوەیەك ناكرێت دژی بوەستینەوە چونكە قۆناغی هەرێم بووە بەكاربەر واتە دەستی كاری ناوەخۆی مووچەیە نەوەك وەبەرهێنانە بەڵكو  توانای كاركردن و پیشەی بەسەرچووە بەهۆی تەمەنی ناوەراست و زیادە خەرجی و بەكاربەری ناوەخۆی لە بازاری دەرەكی. ئەوەی چاك دەكرێت دووبارە دەبێتە فشار بۆسەر حكومەت لە هەموو روێكەوە. لە داهات و باج و گومرگ و نەوت و ئامار و سەربازی و هەوالگری و سنووری و مادەی 140 و كێشەی ئاوارە، ووردە ووردە ریفۆرمی دەكات، دەیكاتە داتا و فایل بەرێگای دیجیتالی و كاغەز لە ئەرشیفی حكومەتی ناوەند دەمێنێتەوە بۆ هەر ئەگەرێكی لەناكاو گۆرینی دەسەلاتی هەرێم بۆ ئۆپۆزسۆن یان حزبێكی نوێ لە كورسی هەرێمدا. ئەو ئامادە باشییە دەبێتە گرتنەوەی دەسەلاتی هەرێمە بۆ بەغدا و دواتر وەك ئاراستەكراو لە سێبەری ئەمەریكا بەرێوەدەچێت. چونكە خواستی گۆرینی گۆمەڵگای سیاسی لە 2003 لە رژێمی بۆ دیموكراسی رژێمی مەزهەبی و پێكهاتەی بوو، جۆرێكە لە شەرعیەتدان بە زلهێزان تاكو ئەم فیدرالیە جێگربێت و بۆشای دەسەلات پربكاتەوە. لەدوای هەڵبژاردنی ئەورووپا و كۆبوونەوەی برێكس لەم ساڵە لەمانگی داهاتوو زۆرگۆرانكاری دەكرێت بۆ جێگیركردنی دۆلار و جەنگی حەماس و هێوركردنەوەی سووریا و گۆرینی ئاراستەی سیاسی توركیا و ریفۆرمی ناوەخۆی ئێران ئەم نیشانانە جۆرێكە لە ماتبوونی ئەمەریكا و پشتەوەی ئەمەریكا لە جوولەیەكی نەرمدایە. برۆن دانیشن چارەسەر بكەن، بزانە ئەمەریكا چ داوایەكی لە سوودانی كردوە و جێبەجێ بكەن پێویست ناكات درۆی بۆ خەڵك بكەن بەناوی درێژكردنەوەی حكومەت و دەسەلات و ئاژاوەی سیاسی و ناوچەگەری. ئەم كێشانە بەسەر حكومەتی هەرێم دەشكێتەوە ئەوكات لە قەڵ و كۆتر دەبن.

# سیاسەتی زەوی سوتاندن

بلۆگەر : جەودەت ئەحمد

بابەت : داهاتووی مرۆڤ

بەروار : 10ی جوون 2024

خاکی خۆلەمێشی واتە جوگرافیایەکی ستراتیژی لەنێوان چەند ولاتێکدا بەردەوام لە وەرزی جیاواز دەکەوێتە بەر پلانی جەنگی شاراوەی دراوسێیان و زلهێزان و ئۆپۆزسیۆنی راست و چەپ، بۆمانەوەی هێزی دەسەلاتی خێزانی و حیزب لە پێگەی حکومەت و جەماوەر، جۆرێکە لە سیاسەتی شێواو دەگرنەبەر بۆ کۆنترۆلکردن، بەرێگای (کرداری دەروونی).

سیاسەتی زەوی سوتاندن لەمێژووی کورد نزیکە لە دێهات و ئاژەل و مرۆڤ و ڕەزوباغ، واتە شێوازێکە بۆ لەناوبردنی ئابووری خۆبژێوی جوتیاری و کرێکاری کە داهاتی چوار وەرزی سال دابین دەکات. جوگرافیای باشوور لەرووی خاك و ئاو و کەشوهەوا ناوچەیەکی لەبارە بۆ داچاندنی دانەوێلە بەگوێرەی رێکخراوی جیهانی لە سالی رابردوو، دەشتی مەخموور کەوتۆتە ناو بازنەی ووشکەسالی، کە مەترسی بۆ سەر شاری هەولێری هەیە.

ئەم سالە لە دەمی شوفێرانی خاوەن ئامێری دروێنە (دەڕاسە) باشترین بەرهەمی دانەوێلەی هەبووە بەهۆی فراوانی رووبەر و نزیك لە رووبار و خاکێکی بەپیت، یەکێك بوو لە شوێنە باشەکانی کشتوکالی بۆ بەرهەمی دانەوێلە، هەرچەندە تەلەفزیۆنی رووداو ئەم بابەتەی پشتراست کردەوە بەهۆی (ناوچەی قەدەغەکراو) تەنها بۆ دوو کاتی جیاواز جوتیاران دەتوانن لە کاتی وەرزی پایز و هاوین، کرداری داچاندن و دروێنە لەماوەیەکی دیاریکراو جوتیاران جێبەجێبکەن، بە ئەگەری ناوچەیەکە لە بۆشای مادەی 140 و پاشماوەی جەنگی تیرۆر و کێشەی ناوەخۆی کورد و عەرەبە. هێنری کێسنجەر لە دیبەیتی کەنالی بی بی سی دەڵێت ناوچەی نێوان هەولێر و بەغدا دەبێتە بۆشای (تیرۆر و کۆچی پێچەوان و پاشماوەی چەك) دەمێنێتەوە کاریگەری بەسەر جیهان دەبێت.

تێروانی من بۆ ئەم (پاردۆکەسە) هێنانەوەیە تەنها گەرانەوەیە بۆ راپۆرتی رێکخراوی جیهانی لەبواری مرۆی و ژینگە، چۆن بەرێگای ژمارە و تۆماری مەیدانی لە کات و شوێنەکان جۆرێك مەترسی لە (کرداری دەروونی) دەخەنە ناو خاکی میزۆپۆتامیا بەناوی گەرم بوونی زەوی و هەلوەشاندنەوەی کۆمەلگای کوردی دێهاتی و رەسەنایەتی بەرهەمی دانەوێلە لە پێگەی جوتیارانی کورددا، چ جۆرە (ناهۆشیاری) خستۆتە ناو راگەیاند و چین وتوێژی کوردیدا بەناوی جەنگێك لە کارنامەی دەغە دەغەی جیهانی بەسەر ئاسایشی خۆراك و نەتەوەی و خاکدا زالە.

گەرانەوە بۆ مێژوو و لێکدانەوە لەگەل ئێستا، تەواو دلنیایم پێدەبەخشێت کە زلهێزان و دراوسێیان جۆرێك لە جەنگی شاراوەی هزری نەتەوەی و ئابووری کلاسیکی، بژێوی ناوەخۆی دەخەنە کارنامەی تۆقاندنی نەتەوەی کورد لە پێگەی حکومەت و حیزب و جەماوەر و راگەیاند و رێکخراوی تایبەت دا. ئەگەرنا دۆخی دانەوێلە لە کوردستان و سنووری مەخموور و پردێ و کەرکوك و دهۆك باشترین بڕی دانەوێلە هاتووە بۆ پرکردنەوەی بازاری ناوەخۆی کوردستان و عێراقدا.

سیاسەتی سوتاندنی زەوی واتە برسیکردن و لەناوبردنی بەرهەمی سالانەی دەستی جوتیاری کورد لە هاوسنووری ناوچەی جەنگی و کێشەی نەتەوەی جۆرێکە بۆ دورخستنەوەی دانیشتوانی کورد لە پێگەی شوانکاری و جوتیاری و کرێکاری، تاکو کۆچی پێچەوانە بۆناو شار رووبدات، لەکۆتای بە کۆمەلێك بەلگەنامە لە وێنە و ڤیدیۆ و نووسین بخرێتە ناو لیستی راپۆرتی جیهانی بەزمانی جیاواز بۆ ئەوەی بلێن ئەم ناوچانە بەهۆی ووشکەسالی چۆلبووە ئێستا بۆشای جەنگی هزری و دەرونی توندرەوەکانە.

کەواتە نائامادەی جوتیاران لە زەویەکان لە دوو وەرزی جیاواز لە لایەن پێشمەرگە و سوپای عێراق و کێشەی نەتەوایەتی و درێژکردنەوەی مادەی 140 جۆرێکە لە فشاری زلهێزان و ئقلیمی بۆسەر بەغدا و هەولێر، تاکو بەرژەوەندی داگیرکەر لە سلۆگانی 11ی سێپتەمبەر بچێتە بواری جێبەجێکردن، بۆ ئەوەی وێنەیەکی گشتاندنی ناوچەی کوردی لەناو هزری توندڕەوی ئاینی و بەرژەوەندی کاپیتالیستی جێگری بکرێت بلێن ئەم شوێنانە شیاوی داچاندن و ژیانی دێهاتی نی یە.

هەر ولاتێك ئاستی کۆمپانیای بەرزبوو و هاوردەی بازاری لەرووی داواکراوی خواستی هەبوو، دەبێتە ولاتانی سێیەم لەرووی هەژاری و چەوساندنەوەی جیهانی ئیمپرالیزم، ئاستی بەرژەوەندی لەسەروی خاك و زمان و ئاینە، بۆیە جەمسەری نیولیبرالی قەباری

کۆمپانیا بەرزدەکاتەوە داهاتی 80%ی جیهان کۆدەکاتەوە وە لە 80% جیهان داهاتیان 20% دەبێت بۆیە سەرجەم ولاتانی سێیەم دەبێتە بەکاربەری ئابووری هاوردەکراو لە سێبەری سیستەمی سیاسی تاك خێزانی و جووت حیزبی و مەزهەبی. ئەوکات خاك و کۆمەڵگا لە پرۆسەی (بەفیرۆدانی مرۆڤ) جێگیردەبێت.

زەوی دەسوتێت بۆ ئەوەی دانەوێلە هاوردە بکەین، یاخود جۆرێکە بۆ دەرکردنی خێزانی کورد لە سنووری جەنگی و مادەی 140، زۆرجار دەبێتە هۆکاری پەککستنی پێگەی ئابووری کلاسیك بۆئەوەی هەولێر پشت بەدەرەکی و ناوەخۆی عێراق ببەستێت بۆکرینی دانەوێل و ساخ نەبوونەوەی دانەوێلە کە ئاژاوەی سیاسی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

کاتژمێر 12:20ی شەوە کۆتای وەرزی درونەی دانەوێڵەیە لە دەشتی بەرانەتی، ئێستا ئاسمان بروسك و نمەبارانە؟ لەتەواوی ژیانم لەم دەڤەرە ئەوە یەکەم جارە بەرکەوتەم بەر ئەم جۆرە کەشوهەوا شێواوە بکەوێت، هەرچەندە دەشتی بەرانەتی دەکەوێتە نێوان زێی گەورە و چیای سەفین واتە رۆژی گەرمە و شەوی فێنکە و ساردە بەلام نەبۆتە هۆکاری ووشکەسالی سەردەم و کۆچی پێچەوانە بۆ شار و ناوچەی شاخاوی، ژیانێکی ئاسای بەرێوەدەچێت لە هەمان ژیانی دەشتی مەخموور و کەلەك و پردێ و گوێرە.

ئەم شێوازە سووتانە جۆرێکە لە چەکی ئابووری بۆ برسیکردن و سەرهەلدانی کارەساتی مرۆی لەرووی نەخۆشی و هەژاری و نەخوێندەواری و بێکاری و کۆچی پێچەوانەی بۆ شار و دەرەوەی هەرێم. کێ لەم سۆنگەوە بەرپرسە؟ تەنها پێگەی دامەزراوەی سیاسی و ئاراستەی سیاسی لە حیزب و شاردا. کەوتنی حیزب لە دەسەلات و هەلبژاردن، جۆرێکە لەفشاری برسیکردنی دەنگەدەر و جەماوەر و پێگەی حیزبی دژ بەناوەخۆی و بەرژەوەندی دەرەکی لەسەر خەباتی پراگماتی مانەوە. واتە قوربانی گشتی بۆ برژوەندی و رازیکردنی ئیمپرالیزم و مانەوەی خەباتی کلاسیکە. بەداخەوە.

**تێگەیشتنی ئێمە قوولە بۆ رووداوەکان بەلام بەهۆکاری چاودێری ئاسمانی و زەوی بەرێگای ئقلیمی و زلهێزی، چینی رۆشنفکران و گەنجان ناتوانن باس لە راستی رووداوەکان بکەن، بۆیە ئەم رووداوانە لە گشتاندنی عەوام دەبێتە رووداوی (شۆرتی کارەبا و هەورە تریشقە و کرداری لەدەست دەرچوون) پەردەپۆش دەکرێت؟**

کاریگەری گەرمبوونی زەوی لە رۆژدابەهۆی دەردانی گازی دوانە ئۆکسیدی کاربۆن لە شەودا دەبێتە هۆی تێکچوونی خەوزراند لەبەردەم فێنکەرەوە کە راستەوخۆ ئەم بۆن و دووکەل بەناو مال بلاودەبێتەوە سەرباری بەرزبوونەی نەخۆشی ڕەبۆ، لێرەدا توانەوەی بەفر لە چیاکانی کوردستان و رووداوی نەخوازراوی لافا و دارمانی زەوی لەئەگەردایە. بەردەوام گردبوونەوەی هەوری دەستکرد لەوەرزی هاویندا، بۆ ئێمە جێگای پرسیارە. سەرباری ئەمە کێشەی گۆشتی سوور لەرووی نرخ بەرزدەبێتەوە چونکە شوانکاری دەکەوێتە بەر رەحمی زەوی سووتان و هەورە تریشقە.

بەداخەوە لە بێخاوەنی باشوور بەهۆی مەشغولبوون بە رۆتیناتی حکومەت و حیزب و خۆشگوزەرانی خێزانی بەرپرسان. دۆخی کوردستانی باشوور لەژێر چاودێری چری جەنگێکی شاراوەدایە بەلام لاوازی سیاسی کورد و ترس لە رووخانی خێزانی حیزب و حکومەت بەردەوام دۆخەکە بە (الله قۆیسەن) درێژدەکرێتەوە.

# کوردستانی باشوور لە چاویمندا

ستوونووس : جەودەت احمد

بابەت : مێژووی فریودراوی باشوور

بەروار : 11ی جوون 2024

## حیزب:

دابرانی حیزب لە بازنەی جیهانی و پرێنسیپی دیموکراسی و جەماوەری و سەرباری هەبوونی مێژووی کۆنگرە و خەباتی دۆلار دیپلۆماسی جۆرێکە لە رەنگدانەوەی تێنەگەیشتن لە جوگرافیای سیاسی و هۆکارێکە بۆ دابران و سەرشێواوی ئەندام و لایەنگرانی کە سەرجەم بۆشایەکان دەخرێتە ئەستۆی قەزاو قەدەر، ئەوکات حیزب دەبێتە داردەستی ئقلیمی و دوژمنی ناوەخۆی لە پێگەی سەرکردایەتی و ئەندام و جەماوەری، بۆیە قازانجی پراگمات لە پێش بەرژەوەندی گشتی و نەتەوەی و خاکدایە، تا ئاستی گشتی فراوانبێت ئەوەندە بەرژەوەندی حیزبی خێزانی و مایکرۆجەماوەری دەکەوێتە مەترسی رووخان. بەلام ژینگە و رووداوەکان بریاری مانەوەی ئەم بارودۆخەن، نەوەك دەسەلاتی دامەزراوەی و سیاسەتی حیزب. بۆیە نوێبوونەوە هۆکارە بۆ کورتبوونەوەی تەمەنی سیاسەتی کلاسیك لەناو جەنگ بێکۆتای کاپیتالستیدا.

## خێزانی حیزب:

جەنگی خێزانی حیزبی بە کۆمەل ئامرازێکە بۆ مانەوەی خۆشگوزەرانی دەسەلاتی مندالداری شۆرەشگێریە واتە ئەم دەرفەتانە بە میرات بۆیان ماوەتەوە تاکو لەکەمترین کات بەرێگای ئامادەکردنی لەدەرەوەی هەرێم لەپێگەی سەربازی و پیشەی زارەکی دەخرێتە پرۆسەی پەروەردەی بە سامانی گشتی بۆ خێزانی تایبەت بەناوی هاتنی کاریزمای و کلتور و نەتەوە جۆرێکە لە ناهۆشیاری کۆمەلگای بەکاربەری ئابووری سەرنجدانە بۆیە لە تۆری کۆمەلایەتی ناوبانگ دەردەکەن، گرینگ نیە چەندی تێدەچێت گرینگ ئەوەیە چۆن خۆیان بناسێنن؟ تەمەنی ئەم جۆرە خەباتە وەك پووشی هاوین لە سەرەتای وەرزی پایز، با دەیبات و نامێنێت. لەداهاتوو ئەم (بوونە) خۆی دەخواتەوە بەهۆی گۆرانکاری نەخشەی جیهان بەسەر ناوەخۆی هەرێم و حیزب و حکومەت و گشتیدا. واتە کات و شوێن و رووداوەکان دەبێتە کاریگەری دەروونی بۆ گۆرینی دلسۆزی و رەفتاری لە تایبەت بۆ دژ و مانەوە.

## حکومەت:

سەرقالی حکومەت بە رۆتیناتی شارەوانی و درێژەپێدانی خەباتی (بکوتە و بەرێکە) واتە گرێیدە و بەرگری بکە. ئەم جۆرە خەباتە تێکهەلکێشکردنی خێزانی میراتی لە دامەزراوەی سیاسەتی حیزبە واتە دانانی بەردی بیناغەی 10 سالی پێش ئێستا هەمان کێشە و رۆتیناتی رابردوو لەسەردەمی ئێستا دووبارە دەبێتەوە بەلام بەهۆی بەریەکەوتنی تەکنەلۆژیا و خەلك لە کەمترین چرکە دەبێتە هۆی ئاشکرابوون و تێگەیشتنی خەلك لە رابردوو بەرێگای بەردوامی داهاتوو لە نوێبوونەوەدایە. بۆوێنە سیاسەتی دامەزراوەی حیزب لە رێگای سیاسەتی بەرژەوەندی حیزب بەرێوەدەچێت بەرێگای دژ و بەرژەوەندی و پێگەی حیزب لە جەماوەر و دۆست و دژمن و بێ لایەن، بۆیە سەرجەم کابینەکان فریاناکەوێت کە ئاوەدانی و کەرتی شارەوانی پێشبخات بەلکو بە رێژەی کارەکان ئەنجام دەدات تا وێنەیەکی گەورە لە هزر و دەروونی خەلك جێگیربکات بلێت ئەمە بوژانەوەیە لەسەردەمی کابینەی یەك بەدوای یەك، نوێبوونەوەی کەسی و خێزانی و رووداوەکان رۆل دەگێرت نەوەك دامەزراوەیەکی جێگر و پلاندارێژراو. هەولێر لەگەل هەلبجە بە پێچەوانەوە سلێمانی لەگەل دهۆك. ئەم مەودایە لێکبدەوە لە سێکتەری گشتی حکومەت بۆت دەردەکەوێت ئاستی دامەزراوی و سیاسی سێبەر لەناو حکومەت چەندە؟ بۆیە حکومەتی رێژەی لە دامەزراوەکان، نیشانەی خەباتی (بەرگری و مانەوەی خێزانی حیزبە).نەوەك مەدەنیەت و سەروەری حکومەت و پەرلەمان. ئەگەر ترسی رووخانی گەیشتە کورسی دەسەلات، ئەوکات هەموو شتێك دەبێتە نەتەوە و خاك و نیشتیمانی. بەمە دەلێن پارادۆکس.

## میدیا، ڕاگەیاندن:

زال بوونی میدیای حیزب لە پێگەی جەماوەر و حکومەت و حیزب بۆ لۆبی (کرداری دەروونی) و خەواندنی هۆشی بینەر و بیسەر لەسێبەری حیزبدا. ئەگەر شیکردنەوەیکی ئاسا بکەین بۆ میدیای کوردی ئەوانەی ئۆپۆزسیۆنن لە توێژی ناوەراست بۆ نوێکردنەوەی و گۆرینی دەسەلات، نەتواندرا بەرگەی مانەوە و درێژکردنەوەی شۆرەشی هزری و زانستی و بەرهەمهێنی ئابووری مرۆی بخەنە روو. چونکە خواستی برسیەتی خەلکی کوردستان زیاتر لە پێشترە لە خواستی گەیشتن بە جیهانی رۆشنفکری لەناوەخۆی کوردستان لەپێگەی عەوام بەگشتاندنی هزر بۆ نوێبوونەوەی تاك لەرەگەزی نێر و مێ، بەلکو پەرتەوازەی خستە ناو ستوونی کلتوری سێیەم لە رۆحەیتی رۆشنبیری بۆ دژی مانەوەی کارنامەی خێزانی حیزب بەسەر لاوازکردنی چینی ئۆپۆزسیۆن لەبەردەم عەوامدا.کەواتە میدیای حیزب توانی دەستوەردان بخاتە ناو جەمسەری کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال دیموکراسی لە ئاستی کۆشکی سپی و کرملین و پەرلەمانی ئەوروپا و کۆمەلەی ولاتانی شاری بریقەداری کەنداوی عەرەبی. لێرە بەخەرجی و کەسی لە پۆستی جیاواز جۆرێك لۆبی نەتەوایەتی پرۆسەی پراگماتیتسی بۆمانەوەی پراگماتی تایبەتی خێزانی، ئاستی مەترسی زیرەکی خۆرێیەری سەرجەم ناونیشانی کورد دەخاتە ناو خێزانی تایبەت واتە کلتوری تایبەت لەسەر کوردستانی گەورە و هەرێمی باشوور گشتاندنی بۆدەکات بەهۆکاری ووشەی تایبەت بە ناوچەیەك و خێزانێك. بۆیە دەستگەیشتنی میدیای حیزب و خێزانی حیزبی جۆرێکە لە کۆنترۆلکردنی دەنگی ناوەخۆ بەدەرەوە وە برینی دەنگی دەرەکی بەناوەخۆ، لێرە ئەوان نوێنەرایەتی مانەوەی خێزانی حیزب و حکومەت و دامەزراوەکانیان بۆبەرێوەدەبەن. ئۆپۆزسیۆن و دەبێتە بلقی سەرئاو لە میدیای ناوەخۆی و جیهانیدا. کۆنە لۆبی بەسەرچوو دەبێتە دەمراستی میدیا و حیزب و خێزان، بەهۆکاری ئازادی وەرگرتنی قسەکردنی پشتگیری بۆ گەرمکردنی گیرفانی لۆبی بیانی لە وێنەی نمایشی میدیای حیزبی بۆ بینەرو بیسەری ناوەخۆی.

## ئابووری سیاسی:

شەقامی کوردی لە بازاری لاوازی هاوردە و پیشەی سوتاوی مووچە و داهاتی کەمی رۆژانە دەخەولێتەوە. هەر ولاتێك لە رژێمی گۆرا بۆ دیموکراسی رژێمی نوێنەری لە پێگەی خێزانی حیزب لە سەرەوی حیزب و حکومەت و کۆمپانیا و جەماوەر، ئەم جۆرە ئابووری سیاسییە بەرێگای دەسەلاتی جەمسەری نیۆکۆمەنیست پردەکرێتەوە بەهاوکاری هێشتنەوەی نیۆلیبرالی لە سەروەری دامەزراوەی فیدرالیزم وەك پەناگەیەك بۆ رزگارکردنی ئەم نەتەوەیە و خستنە ژێر سێبەری دەسەلاتی ناوەراستی بەغدا و بلاوەپێکردنی بۆ هێزێکی لاواز لە پێگەی دەستووری کلتوری و مەزهەبی و نەتەوەی بۆ پەرلەمانی فرە رەنگ و بێ دەسەلات واتە قەبارەی عێراق و هەرێم بەپەرتەوازە و لاوازی بەرێوەدەچێت تاکو لەدەستی ئەمەریکا و ناتۆ رزگاری نەبێت سەرباری ئابووری لاواز و داهاتی نەوتی لە بانکی ئەمەریکا و نەبوونی پرۆژەی ئابووری ناوەخۆی بەسەر کالای هاوردە. بۆیە بازاری هەولێر لە پێگەی هەرێم لاواز و بێناوەرۆك و لەرزۆکە لێرە جێگرەوەی پرکراوەی ئابووری کۆمەنیستی نوێ، دیوی هەژاری بەرزدەکاتەوە بۆ ئاستی دەولەمەندی بەناوی خۆشگوزەرانی و ئابووری کۆمپرادۆری. کۆمەلگای عێراق و کوردستانی دەبێتە ئابووری مرۆی بەفیرۆدراو. ناوەناوە کۆمەلێك گەنج هەناردەی دەرەوە دەکەن بۆ خوێندن یان کۆمەلێك پرۆژەی ناوەخۆی ئەنجامدەدن بۆهەمووی بۆمانەوەی خۆیان و درێژکردنەوەی بەرژەوەندی دەسەلاتی سێبەر و هەرێمێکی لاوازە.

## دەولەتی سێبەر:

کاریگەری دەسەلاتی سێبەر بەسەرناوەخۆی هەرێم جۆرێکە لە شێواندنی ژینگە و خەلك و میدیا و هێشتنەوەی حیزبی خێزانی، هەرێمی باشوور لە بۆشای خەباتی هزری دامەزراوە واتە جۆرێك لەخەباتی ناسیۆنالیزمی نەتەوەی چەکداری و کرێکاری و جوتیاری بۆ خەباتی شاخ بەناوی بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لەپێگەی سێبەری جیهانی ئەقلیمی و زلێهزیدا، ئەمە هۆکاری ئەوەیە بەردەوام حیزب لە جەستەی خۆی دەتوێتەوە بەهۆی دەستوەردانی دەرەکی و هێشتنەوەی خێزان لەپێگەی سەروەری بەسەر قەوارەی هەرێم وەك ئایکۆن و رەمز و مەرجەعیەت و پیرۆزی لە ئاین و کەسی و حیزبی و دەسەلاتی رەهایدایە، بۆیە دۆزی دەرەکی بەسەر ناوەخۆ دەبێتە پەلەقاژەی سیاسەتی حیزب و دامەزراوەی. واتە دامەزراوەی حیزب لەهەموو روێکەوە بەپرس ورای دەرەکی بووە، بۆمانەوە لەناوەخۆدا. ئەگەر بینەری تاوانی مێژووی حیزب بین، دیارە زۆرترین کادیری لێهاتوو دورخراون ولەناوبردراون بەهۆکاری پاراستنی مانەوە درێژەپێدانی ئەم پراگماتیە.

## مایکرۆ جەماوەر:

مایکرۆ جەماوەری جۆرێکە لە (ئەصحابەی دەسەلاتی دوو حیزبی) بۆمانەوەیان پابەندی گرێبەستی هەرێمی باشوورە لە پێگەی نەتەوەی خۆیان مەلاسداوە لەترسی کەوتن، بۆمانەوە درێژە پێدانی خۆیان، بۆیە (دز) واتە گەندەل دەچێتە ناو دوعای مەلاکان و میمبەرەکان. لێرە چاوپۆشی دەکرێن وە جۆرێك لە ئاژاوەی کۆمەلایەتی پروپاگەندەی ئەنجام دەدەن بۆ ئەوەی جۆرێك لە دەروون شێواوی خەلك بۆخۆیان بەکاربهێنن بەناوی بەرەی شەقامی ئاین و کلتور و زانست و سیاسەتی بێبنەما بەلکو سەرجەمیان پابەندی بری داهاتی حیزب و خۆشگوزەرانی تایبەتن لەپێگەی ئۆتۆنۆمی بەرێوەدەچێت. بۆیە مایکرۆ جەوماوەری ناتوانێت دەسەلات بگۆرێت و پەرلەمان بەهاولاتی بکات و سەرورەی حکومەت جێگیربێت بەلکو کوتانەوەی (دەروێشێکە کە بۆبرسیەتی وەرگی دەف بۆ شێخ دەکوتی کە پێی دەلێن وەرگ دەفی تەکیەی).

## چینی رۆشنفکران:

چینی ناوەراست لە رۆشنفکران جۆرێکە لە ماتبوون و مانەوە بەهۆی مەترسی هێرشی ئقلیمی و زلهێزی بۆ هێشتنەوەی هەرێم لە سێبەری ئەم جۆرە خەباتە پراگماتیە بۆ ئەوەی هیچ گۆرانکاری ریشەی نەچێتە بواری جێبەجێکردن، ئەگەر تەمەنی پەرلەمان و حکومەت بۆ 5 سالی تر درێژبکرێتەوە.گرینگ ئەوەیە نوخبەی هۆشیاری سەرکوت بکرێت و درێژە بەم چەقبەستووە بدرێت. لێرە جۆرێك لە نوێبوونەوەی لەناوبردنی ئەم چینە دەچێتە بواری جێبەجێکردن بەرێگای ناساندنی کەسی لەپرۆژەی گشتاندنی هزری تیرۆر و تێکدەر و ئاژاوەگێری بۆئەوەی ئەم کەسە کەلەناوبردرا بەرێگای درۆن و رەفاندن و کوشتنی راستەوخۆ لە سێبەری جەنگی پرۆکسی و ئاژاوەی سیاسی، نەبێتە تولەی کۆمەلایەتی، ئەوکات دەسەلاتی خێزانی وەك رێوی خۆی رزگاردەکات دەبێتە پالەوانی دلسۆزی دلدانەوەی خێزانی کورد. سەرجەم تاوانی داهاتوو دەبێتە پرۆژەی جیهانی لەسەر گرێنتی مانەوەی سیستەمی دوو حیزبی بەناوی هاوپەیمانی هاوالگری جیهانی لە ناوەخۆی عێراق و هەرێمدا. زۆرترین تاوانی کەسی بە نێودەولەتی کراوە، تا ئێستا هیچ کەسێك نەیتوانیوە تاوانباران بدۆزنەوە، بۆیە ئەوان (خێزانی حیزب) لە سەرورەی دەمێنەوە وە چینی رۆشنفکران دەبنە قوربانی ئەم خالە کە کۆمەلگا بۆناهۆشیاری بگەرێتەوە لەسەر گرینگی مانەوەی خێزانی حیزبیدا. سیستەمی سیاسی باشوور لە ئەورووپا بەکاربهێنە بەرگەی 24 کاتژمێر ناگرێت بەخێزانەوە لە تورگەی زبلدانی مێژووی دەکرێت چونکە مێژووی فەلەسەفەی و داهێنان و پیشەسازی و کلتوری لەپێش هێزی کلاسیك جێگیربووە. بۆیە چینی ناوەراست دەبێتە بێ بەرهەمی زانستی و فریوخواردوی دیموکراسی بەکاربەرە لە رووی کلتوری و توێژی رۆحانی دەبێتە نوێبوونەوەی عەوام لە ئاین و بەکاربەری ئابووری دیموکراسییە و کۆمەنیستی نوێ، بەهەردوو پێگە ناتوانن کۆمەلگایەکی زانستی و هزری و هاولاتی بووون دابمەزرێنن. **یەك مژگێنی خۆش هەیە، ئەوەیە سەرجەم قوربانی مێژووی کورد وەك (ئامراز و ئامانج)ی کاپیتالیستی کۆمەنیستی کۆن و نوێ بەکارهاتوو لە جەستەی ئەم خێزانە حیزبیە بۆگەیشتن بەرۆژهەلاتی ناوەراست، تا ئێستا لەهەمان خالی ناهۆشیاری ئەو سەردەمی دەخولێنەوە لە کۆتای زلهێزان دەیگۆرن بۆ ئۆپۆزسیۆنی و بەکاربەری ئابووری، واتە خەباتی کوردی لە سەردەمی کلاسیك بۆسەردەمی چاخی دیجیتالی و لۆماریٔ.**

# ڕۆمانی شەرەف ...

# (تورکیا وەك تۆپەلە بەفرێك دەتوێنێتەوە لە داهاتووی نادیار)

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : خوێندنەوە پەرتووك
بەروار : 20ی جوون 2024

بەگوێرەی خوێندنەوەی من کە باشترین نووسەری ئەدەبی لە تورکیا دوو رەگەزی جیاوازن کە نوێنەرایەتی زیاتر لە 90 ملیۆن کەس دەکەن ئەوانیش (عزیز نەسین و ئەلیف شەفەق)، ستوونی کلتور لە ناوەراست بریتی یە لە نووسەرانو ئەدیبان و رۆشنفکران کە رۆحیەتێك دەبەخشن بە کلتور و کاریگەری ئەرێن بە رێژەی بەسەر ناوەخۆی ولات و کۆمەلگا و حکومەت هەیە، هۆکاری ئەم کاریگەرییە بەهۆی نوخبەی (هزری پەتی) رەسەن کە جۆرێکە لە تێگەیشتن و دەرخستنی بۆشای پەیوەندی کۆمەلایەتی لەگەل دەسەلات دەخاتە بەرباس لە مەودایەکی دیاریکراو بە چیرۆك و رۆلگێرانی فیزیکی دەخاتە ناو ژینگەی رایالیستیکی (راستی) ئەم کۆمەلگایە. چۆن لەسەردەمی چاخی بەردین و برۆنز و ئاسن رۆلی ئاژەل دەخرێتە کرداری دەروونی مرۆڤەکان بۆ ئەوەی وێنەیەکی ئەستراکیت واتە (نادیار) پیشاندەدات کە چ کاریگەری بەسەر هێزی هۆز و سوپا و دەولەتەوە هەبووە، ئەم جۆرە هەوێنە گوازرایەوە ناو ئەدەبیاتی جیهانی بۆ شاردنەوە و مەترسی لەناوچوونی کەسەکە واتە (رۆگێرانەکە) لە چیرۆکەدا وە پشوێکی درێژ بە مانەوەی ئەدیبان دەبەخشێت بۆ جەنگێگی بێ کۆتا لەگەل دواکەوتووی کۆمەلگا و دەسەلاتی میراتی خێزانی لە جیهاندا.

نووسەرانی ئەدەب جۆرێکە لە پیشاندانی راستی ئەم کۆمەلگایە لەرووی کلتوری و مێژو و سیاسی و سێکتەری گشتی شارەوانی و دامەزراوەی حکومی و ئاراستەی حیزبی کەلە دەسەلاتی سیاسی ئەم ولاتە بەرێودەبات، بۆیە بۆ تێگەیشتن لە هەر نەتەوە و خاك و مێژوو، پێویستە ئەدەبی ئەو ولاتە بخوێنییەوە، بە تێگەیشتن لە ئەدەب، دیوی شاراوەی ئەم کلتورە و دەسەلاتەت بۆ روون دەکاتەوە کە چۆن لەرابردوو بۆ داهاتووی بەردەوام لەنمایشی دەسەلات و حکومەت و خاك و جەماوەر و حیزب و خێزان دەخولێتەوە سەرباری چاودێری توند لەسەر میدیا و نوخبەی رۆشنفکران و رێکخراوی ناوەخۆی و جیهانی. بەلام ئەدەب زۆر بەئاسانی ئەم سنوورە دەشکێنێ و لە ستوونی نووسین سەرجەم گۆشەکانی ژیان بەچەشنی رەوانبێژی پەتی و نوێ دەخاتە بەرباس، واتە ئەدەب هۆکاری خالیکردنەوەی مێژووی و کلتوری و پێگەی دەولەت و حکومەت و نەتەوەیە لە رابردوو بۆ ئێستادا. بۆ وێنە ئەگەر من لەرووی سیاسی، شیکردنەوە بۆ ناوەخۆی عێراق بکەم دەبێت پاشاخانی ئەدەبیاتی کوردی و عەربی بخوێنمەوە تاکو تێگەیشتنی تەواوم هەبێت بۆ دۆخی سیاسی و دامەزراوەی و حیزبی و جەماوەری. بۆیە ئەدەب کلیلی گەیشتن بە نهێنی شاراوەی هەر نەتەوە و ئاین و خاکێکە.

ئەوەی بۆمن جێگای باسە، کەسایەتی ئەلیف شەفەق شێوازێکی لە دارشتنەوەی ئەدەبیاتی تورکیا بەرێگای ناوەندی تێگەیشتن لە پێکهاتەی نەتەوەی و ئاین و زمان وەك پێگەی (فیدرالیزم) مافی بەسەرجەم دانیشتوانی ناوەخۆی تورکیا داوە بۆ گەیشتن بەیەکەوە لە هێلی نووسینەکانی رۆمان کۆیان بکاتەوە. ئەمە جۆرێکە لە دیموکراتیزەکردنی کلتور و خاك و دەولەت نەتەوە. واتە ترازانێکی رێژەیە بەسەر دەسەلاتی دەولەت نەتەوە و حکومەت و حیزب و جەماوەردا. ئەلیف دیوی راستی کلتوری تورکیا و کوردستانی باکوور و کەنداوی عەرەبی و خۆرئاوای پیر وەك لەندەن بەوێنەیەکی زیندوی سەردەمی کۆن لە ئێستا دووبارە دەکاتەوە. واتە جوانی و ناشرین و خۆشی و ناخۆشی و دژ و بەژەوەندی بە تێکهەلکێشکراوی دەخاتە بەرباس لە ناو رۆمانی شەرەف. لەم رۆمانە دیوی تاریکی کۆمەلگای کوردی باس دەکات لەبارەی ژن و کچ لەرەگەزی مێ کە چۆن بووینە قوربانی کۆمەلگا و قسەو قسەلۆکی دێهاتی و شاری سەرەباری ئەم کلتورە لەناوەخۆی ولاتانی خۆرئاوا لەگەرەکی تورك و کورد نیشن هەمان جۆرە کلتور دووبارە دەبێتەوە. واتە کاریگەری کلتوری بیانی هیچ گۆرانکاری ریشەی نەکردو سەر خێزانی کورد لە پێگەی ئەنادۆل وە خێزانی تورك لە پێگەی دیموکراسی و هاوبەشی ئەستەنبۆل لە ناوەراستی سیستەمی ئاراستەی مەسیحی مۆدێرن و ئیسلامی عوسمانی مۆدێرین. ئەلیف دەلێت ( شەرەف لەناو پێخەفی جیگا نیە بەلکو لە دلدایە). ئەم جۆرە لۆژیکە ئەرێنیە واتە هەبوونی زیرەکی دەروونی دەتوانی کاریگەری بەسەر کۆمەلگا هەبێت بەتایبەت لە نێو ئافرەتان، چونکە جۆرێکە لە رەگەزی مێ دەتوانێت جیهان نوێ بکاتەوە پەروەردە بکات.

لێرە بەرچاورورونی دەخاتە ناو خێزانی کورد بەهۆی لاوازی پێگەی گەنج لە کارگێری دەولەت و سکێکتەری گشتی حکومەتدا کە بەهۆی نەخوێندەواری و دوورەدەستی و دابرانی دێهات لە کەرتی شارەوانی هۆکاری سەرهەلدانی جەنگی پارتیزانی کوردە لەم دێهاتەنە سەرباری دواکەوتنی خێزان لەرووی خوێندن و برسیەتی و نەخۆشی و ئابووری مرۆی، ئەمە زۆر روونە کە ئەلیف بەرێگای مامەن و چەتەگەری و کۆمەلگای کوردی باکوور دابرانێکی تەواوی هەیە لەگەل کۆمەلگای تورکی لەناوەخۆی ئەنقەر و ئەستەنبۆل و

کەرتی ئەورووپا، بەلام لە ئەزەلەوە نەتوانراوە هزری پەتی لەناوەخۆی تورکیا ببێتە هەوێنی دامەزراوەی ولاتێکی پیشەسازی و پێکهاتەی نەتەوەی و جوگرافیای سیاسی لەناوەخۆی ڕۆژهەلاتی ناوەراست و باشووری ئاسیا و هاوشانی شارستانی یۆنانی کۆن. دەبێت کۆمەلگای تورکیا لە پێکهاتەکان پرسیار لەخۆیان بکەن بۆچی ئەدەبیات دەتوانێت ولاتێکی نەتەوەی بکاتە فیدرالی و پێکهاتەی بەلام لە (ریالیستیکدا) نەتواندراوە جوولەی سیاسی و ڕۆشنفکران و کەرتی ئابووری و فەلسەفی کە هاوشانی یۆنۆانی کۆنە، هیچ کاریگەری نەبووە بەسەر ناوەخۆی تورکیا و دەوروبەری. جیهانی تورکیا مێژووی سێ کیشوەری بەرێوەبردە بەهاوکاری ئەلمانیای کۆن کەچی لە جەنگی یەکەم و دووەم و سارد و جەنگی دیجیتالی هیچ خۆرێبەری ئابووری (مێگا پرۆجێکت) بەرووی خوێندن و داهێنانی هزری پەتی خۆی نەبووە بەلکو هاوردەکراوێکی دراوسێ و جیهانی ناتۆبووە لەم سۆنگەوە. ئەمە تێروانینی من بۆ تورکیا بەرێگا رۆمانی شەرەف.

دیوێکی تری کوردستانی باکوور بەهۆی هەلکەوتەی مانگای بەپیتە چونکە هەبوونی کانگای ئەلماس جۆرێکە لە ئابووری سروشتی ژێرزەوی لە گرانترین بەردە بەنرخەکانی جیهانە، دووبارە هیچ رەنگدانەوەی نەبووە لە ژێرخانی کوردستانی باکوور بەهۆی خەباتی پراگماتیکی شۆرەشگێری بۆ دواخستنی کۆمەلگای کوردی باکوور لە پێگەی (دژ و بەرژەوەندی) لەناوەخۆی تورکیا و کوردستانی گەورەدا. لێرە جۆرێك لە ئاژاوەی سیاسی دەخاتە نێو کۆمەلگای کوردی و تورکی کە رەنگانەوەی لەناوەخۆی خۆرئاوا هەیە بەهۆی بەریەکەوتنی کلتور جۆرێکە لە رەگەزپەرستی لەسەدەی 21 لە سالی 2024 رەنگی داوەتەوە، ئەم تێگەیشتنە هۆکارە بۆ دواخستنی کۆمەلگای تورکیا لە پێکهاتەی نەتەوەی بۆ ئەوەی نەبێتە هەوێنی گۆرینی ریشەی تورکیا لە (پرۆژەی بچووك بۆ مێگا پرۆژە) بەلام ئەم خوێندنەوەی من تەواو دلنیای دەبەخشێت کە خێزانی تورك ناتوانێت خۆی رزگاربکات لە قەیرانی کلتوری کۆن سەرەباری گۆرانی بۆ بەکاربەری ئابووری نوێ. لە سۆنگەی کۆن دوادەکەوێت وە لە سۆنگەی نوێ تەمبەل دەبێت ناتوانێت بەرهەمی هەبێت بەلکو دەبێتە بەکاربەر.

رۆمانەکەی ئەلیف بەهەوێنی گۆرانکاری داهاتووی نادیاری تورکیا دەزانم بەهۆی پێشهاتە و داوهات لە گۆرانکاری ناوەخۆی تورکیا و دەوروبەری چونکە تێگەیشتن لە هەستی خاك دەتوانێت گوێت لە دەنگی دایکبێت ئەوکات بەئاسانی بە یەك چاو داهاتووی ئەم ولاتە و کۆمەلگایە بەرێگای رۆمان و چیرۆك و ئەدەبی هاوبەش لە تورك و کورد دیوێکی شاراوەی ناوەخۆی تورکیا دەخاتە سەر شانۆی جیهانی میدیای دیجتالی و رەخنەگرانی ئەدەبی و خوێنەرانی رۆمان و کلتور ئەنجامێکی ئەرێنی بەدوای خۆیدا دەبهێنێت. نامەوێت شاباش بکەم بەسەر رۆمانی ئەلیف بەلام خوێندنەوەم بۆ ئەم بابەتە وەك ئەوە وایە کە خێزانێك لە چەشنی کلۆبەفر بتوێتەوە بەهۆکاری بەرکەوتنی کلتوری کۆن و نوێ کە هیچ پاشاخانی هزری پەتی و داهێنانی ناوەخۆی نەئافراندوە، بۆیە قۆناغی داهاتووی تورکیا وەك ئەم کلۆبەفر دەتوێتەوە سەرەجەم دیوەشاراوەکانی دەردەخات و خۆی ریفۆرم دەکات بەجارێك رزگاری دەبێت لە قەیرانی میراتی ئیمپراتۆریەتی و عوسمانی مۆدێرن لەناوەخۆی ئاسیادا.

دیوێکی تر تورکیا وادەردەخات بەردەوام شوێنی پەرینەوەی پەنابەران بووە بە ئاسانترین رێگا بۆناوەخۆی ئەورووپا بەهۆیکاری ئەندام بوون لەناتۆ و هاوسنووری خاکی و ئاوی و ئاسمانی و متمانەی خۆرئاوا وەك دۆستێکی نزیك، خەلکی تورکیا زۆربەئاسانی دەستیان بە ناوەخۆی ئەورووپا گەیشتووە لەرووی خوێندن و کارکردن و گەشتیاری و پەیوەندی کلتوری هاوبەش لەناوەخۆی و دەرەوەدا. لێرە کلتوری شەرەف گوازراپتەوە بۆناوەخۆی خۆرئاوا بەهۆکاری تۆلسەندنەوە و سەپیکردنەوەی رووی خێزان لە کرداری مێینە بەسەر نێرینەدا. تا ئێستا ئەم کلتورە بەردەوامە کە زۆرترین رێژەی ئافرەت دەبێتە قوربانی دۆخی ناوەخۆی تورکیا لە پێگەی تورك و کورد، بەهۆکاری ئەوەی بەرکەوتەی ژن زیاترە لە پیاو لەرووی پێگەی کارکردن و پەیوەندی کۆمەلایەتی. بۆیە لە ژیاری خۆرئاوا ئەم جۆرە تۆلە میراتیە دەبێتە شۆك بۆ کلتوری بەریتانیا و ماکێکی رەش بەسەر کلتوری تورکیا. ئەمە بۆچوونی خوێندنەوەی منە لەبارەی ئەم رۆمانە، تۆ ئازادی چۆن بیردەکەیتەوە و خوێندنەوەت بۆ ئەم رۆمانە هەیە لە داهاتوودا.

# ڕۆمانی شیکاگۆ

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : هەلسەنگاندنی پەرتووك

بەروار / 22ی جوون 2024

زۆربەی کات بۆ گەیشتن بە ناوەڕۆکی کلتور و مێژووی هەر نەتەوە و خاکێکدا، پەنا دەبەم بەر خوێندنەوەی ئەدەبیاتی بیانی لە جۆری رۆمان، چەقی دۆزینەوەی تێگەیشتنە لە پەیوەندی کۆمەڵگا لەناوەخۆی هەر نەتەوە دابێت، بۆیە لەدوای تەواو بینەری بەڵگە فیلمی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی رووسیای گەورە و هاتنی جەنگی یەکەم و دووەم و جەنگی سارد و جەنگی چاخی دیجیتالی و سەردەمی ئولترامۆدێرن جیهانی ئەمەریکا زۆرجیاوازە لەگەڵ رابردوو، کۆتا کۆبوونەوەی نازیەکان کاتێك هەرشەی لەناوبردنی پێکهاتەی نەتەوەی یەعقوبی کرد بووە هۆکاری کۆچ لە ئەورووپا بۆ ئەمەریکا، سەرباری دامەزراوەی دەستووری سالی 1787 کە سەرجەم خەڵك لەسێبەری ئەمەریکا گەورە رێکخستووە، من پشتگیری تەواوی خەلکی ئەمەریکا دەکەم بەلام زۆر تەبانیم لەگەڵ دەسەلاتی ئەمەریکا لە چوارچێوەی کاپیتالیستی و دیموکراسی، چونکە ئەوەی من تێروانینم لەم رۆمانە بۆ دەردەکەوێت هەبوونی جیهانی کاپیتالیستی لە دیوی شاراوەی ئەمەریکا ئەم دەسەلاتە بەرێوەدەبات واتە دامەزراوەی ئەمەریکا لەسەر بناغەی ئابووری نەتەوەی یەعقوب دامەزراوە بۆیە ئێستا دەسەلاتێکی رەهای لە زیرەکی دەروونی و ژمارەی و جەستەی کۆکردۆتەوە بەناوی (ئەمەریکای گەورە). کۆکردنەوەی عقل و هێز بەرێگای دەستوور هۆکارە بۆ دامەزراوەی ئەمەریکا لە چوارچێوەی کارێکتەرێکی (دیسکۆ) واتە کەسێك لە ئەمەریکا کەناسنامەی ڕەسەنی ئەمەریکا نیە و پێکهاتەی جیهانی یە، ئەوە بە چاوی دووەم سەیردەکرێت بەردەوام یاسا و رێسای تایبەتی بۆ دارێژراوە لەئەگەری هەڵقوزینەوەی ئەم (بوونە) لەناوەخۆی ئەمەریکا بەهۆی هەر ئەگەرێك بێت واتە زەوی کۆبکەیتەوە لە ناو چیپێك دابمەزرێنی هەر لە سێبەری شارستانی ئەمەریکا لەدایك بووە بەرامبەر بە مانەوە و هاولاتی و داهێناندا. ولاتی هەمووانە بۆهەمووانە بەلام سەرجەم هێز و خوێن و جەستە لە سێبەری ئالای شەکاوەی ئەمەریکا دەشەکێتەوە واتە (بوون) لەدوای خاك و ناو و سەروەری ئەمەریکایە. ئەمە تێروانینی من.

بەهۆکاری رۆتیناتی کارگێری شارەوانی و ناشارستانی دانیشتوانی دەوروبەری هەولێر، بەردەوام هۆکارێکە لە کێشەی بێ ئاو و کارەبا و رێگاوبان و نەخۆشی و نەخوێندەواری و هەژاری و بێکاری، ئەم رێگایە وەك پاسی شەقامەکانی 40م وایە بەردەوام زۆرترین کات دەبەخشێت بە مرۆڤ لە هەلبەزودابەزی رۆتیناتی ژیان لەگەڵ کات، بۆیە خوێندنەوەی ڕۆمانی شیگاگۆ وەك چاوتروکانێك هاژوکارێکی خێرایە بەهۆی هەبوونی کاتێکی زۆر لە شەوڕۆژێکدا کە بەخێرای ئەم رۆمانە وەك پاس بەناو کێشە و گرفتی و رۆتینانی ژیانی من دەخولێتەوە بە ئاسانترین رێگا کۆتا بە سێ بەشی ئەم رۆمانە بهێنم، بۆیە بەتامەزرۆوە ویستم بۆچونی خۆم لەبارەیەوە بنوسم بۆچی ئەم رۆمانە گرینگە بۆ ئێمە؟ هۆکارەکەی روونە کە دیوی شاراوەی رۆژهەلاتی ناوەراست و کۆمەلگای ئەمەریکای باکوور بەیەکەوە دەبستێتەوە کە جوانیەك بە کات و شوێن و رووداوەکان دەبەخشێت کە چۆن کارێکتەرەکان بەهۆی بەرکەوتنی جوگرافیا و کلتوری و ئاینی جیاواز ژیانێکی هەمەچەشن بەم رۆمانە بەخشی. بۆوێنە کۆمەلگای عەرەبی لە جەستەی بەکاربەرێکی هەوسباز و خاکێکی گەرم بۆ تێکەلبوون بە کلتوری خواردنەوە و خۆدەرخستن و خۆهەلواسین بە کلتورێکی نامۆ بۆ ئەوەی دەروونی تاکەکان ئارام بکاتەوە لە پێگەی خوێندن و گەشت و مانەوە و بازرگانی لەناوەخۆی ئەمەریکای گەورە.

جیهانی ئەمەریکا بازارێکی ئازادە لە هەلبژارنی بەرهەمەکان بەگوێرەی تێچووی گیرفان دەتوانیت ئازادی پلەبەندی دابین بکە لە خۆشگوزەرانی کاپیتالیستی و دیموکراسی و شارستانی، ئەوەی بەلای من جێگای پرسیارە بۆچی ئاستی رەگەزپەرستی تا ئێستا و دوای جۆرج فلۆید بەردەوامی هەیە کە کلتوری رەش و سپی پێست بەك نەگەیشتووە کە لەقۆناغی هەولوەشاندنی و خێزان و پەرتەوازەی ئابووری مرۆی و شێواندنی ئەم کۆمەلگایە رەشپێستە لە بەردەوامی دایە بەهۆکاری پلەبەندی پێست و کلتور و رەنگ. دۆخێکی شێواوی خستۆتە ناو خێزانی رەشپێستەکان کەلە نالەبراترین ژیانی رۆژانە گوزەر بکەن لە سێبەری دیموکراسی و نیولیبرالی؟ بۆچوونی من لە بارەوە دۆخێکی شاراوەی کاپیتالیستی یە بۆ ئەوەی جەمسەری ناوەخۆی رەنگی رەش و سپی بەیەك نەگەن بەردەوام لە دوژمنداری دابن وە سەروەری ئابووری لەنوخبەری کەمین بەسەر زۆرینەوە گەورەی ئەمەریکا بەرێوەبەرن بەناوی (جەنگ و ئاشتی) ئاژاوەی سیاسی و بەکارهێنانی دۆلار و جیۆسیاسی جیهاندا. واتە بەیەك نەگەیشتنی پێکهاتەکان لەناوەخۆی ئەمەریکا لە بەرژەوەندی کەمینەدایە کە دەسەلاتی شاراوەی ئەمەریکا بەرێوەدەبەن. بەلام وا دەبینم ئەم جیهانەی ئەمەریکا هەلدەوەشێتەوە لە قەیرانی پەنابەری و رەگەزپەرستی و ئابووری شاراوە و حکومەتی دوو حیزبی، رزگاری دەبێتە و دەگەرێتەوە سەر (هزری پەتی خۆی) بەناوی ئەمەریکای ڕەسەن لە میراتی هیندیە سوورەکان و دەرکردنی دەسەلاتێکی هاوردە بەناوی راگری شۆکی ئەمەریکا لە جیهان و ناوەخۆدا. ئەم کودەتایە هەر روودەدات چونکە خێزانی گەورە و عەشیرەت و سنووری خاکێکی فراوان، دەبێتە هۆی رووخانی

ئەمەریکای (تەزویر) لەدەستەی دەنگی خاکدا، دەمێکە خەلکی ئەمەریکا هەستیان بەم شەرمەزاریەکردیە بۆچی ئەمەریکا لە جەستەی خۆی لەدایك نەبووە بەلکو ئاوەسبووە بەهۆی (بوونی) دەرەکی لە هێزی ئابووری و مرۆی و سیاسیدا؟ ئەمە بۆچوونی منە بۆ داهاتوی ئەمەریکا؟ تۆ ئازادی لە هزری خۆت.

خۆپیشاندان و رەگەزپەرستی و بازرگانی بەجەستەی ئافرەت و خوێندنی دەرەکی بۆ خەلکی نافەرمی ئەمانە شێوازێکە کە ئەمەریکای لەسەر دامەزراوە، من رەقەم لە سوپای ئەمەریکا نابێتەوە چونکە لە نزیکەوە لەگەل خانەنیشان و خۆبەخشان کاری میدیایم کردوە دەزانم چ جۆرە دۆست و هاوپەیمانێکن لەرووی کەسی نەوەك دەسەلاتی سیاسی و ئابووری شاراوەی ئەمەریکا بەلکو خەلکی ئەمەریکا ولاتێکە قەبارەی و بەرهەمی و خاکی گەورەیە کە رەنگدانەوەی قەباری مرۆڤەکانە لە رووی هێز و داهێنان، دروستکردنی خێزانێکی شارستانی لەناوەخۆی ئەمەریکا ناتوانێت رەنگدانەوەی رۆژهەلاتی ناوەراستی هەبێت وەك مصر و کەنداوی عەربی و عێراق و ئیسرائیل، بەلکو (عقلی پەتی) دەبێتە هەوێنی دامەزراوەی شارستانی دوور لە خێلەکی و دواکەوتووی. وێنەی ئەمرۆی جیهان لەسێبەری نیولیبرالی نوێ و کۆمەنیستی نوێ دوو جەنگی نەبراوەی ساردو گەرمە لە جیهاندا. نە قوتابیەکی مصری دەبێتە ئەمەریکی و داهێنانی مصری وە نە عێراقێکی رژێمی دەبێتە دیموکراسی و سەروەری وەك کەنداوی عەرەب دەبێتە کۆمەلگایەکی نەفتخۆری و بەکاربەری ئابووری هاوردەکراو لە سێبەری بەرژەوەندی حیزب و دامەزراوەی حکومەت و سنووری هاوبەشی دەولەت و هەرێمە لەناوخۆی رۆژهەلاتی ناوەراست لە سێبەری ئەمەریکای گەورە.

شیکاگۆ بەردەوام دەسووتێت بەهۆی قوربانیدانی خەلك لەپێگەی ئالا و سوپا و بازرگانی چەك و سیاسەتی ئاژاوەی دۆلار لەناوەخۆی جیهاندا، بۆیە سەرجەم ولاتانی لەرزۆك لە پێگەی رۆژهەلاتی ناوەراست لە براندێکی دروستکراوەی ئەمەریکا دامەزراوە وە مێژووی بەسەرچوونی ئەم هێزانە لە دەستی واشنتۆن و ئابووری سیاسی شاراوەدایە بۆیە جیهانی خوێندنی قوتابی لە ئەمەریکا و چاودێری ناوەخۆی و دەرەکی و ئقلیمی بەسەر ئەم خوێندکارانە هیچ لەبابەتی مانەوەی ئەمەریکا و دەسەلاتی سێبەری ئەمەریکا ناگۆرێت بەلکو ژینگە و رووداوەکان گۆرانکاری بەسەر (کات و شوێن و رووداوەکان) دەکەن لە دژ و بەرژەوەندی ئەمەریکا. ئێستا وادەنووسم دلنیام سەرجەمە وەرگێرانی بۆدەکرێت و چاودێری دەخرێتە سەر بلاوکراوەکانم، چونکە من لە سێبەری ئەمەریکا لەدایك نەبوومە و بەلکو ئەمەریکا میوانە لەمالی من وە سەرباری میواندارای بەردەوام جەنگی دەروونی دەخاتە سەر رۆحیەتی نووسینم، بەم جۆرە جەنگانە ناکەوم چونکە لە شەقامی هەولێر و عەشیرەتی خەیلانی لەدایکبوویمەو وەك ئەمەریکایەکی رەسەن خۆم پێگەیاندوە نەوەك هەناردەو هاوردەی سێبەری ئەمەریکا بم، مانەوەی من وەك گەنجێکی پیر لەسێبەری ئەمەریکا هیچ کاردانەوەی ئەرێنی و نەرێنی نابێت چونکە من چاوەروانی کات دەکەم ئەم جوگرافیایە بگۆرێت لە پێگەی حکومەتی دوو حیزبی و مایکرۆ جەماوەری و ئقلیمی. ئێمە بەردەوام دیوەخانمان کراوە لە کوردستانی باشوور وەك هاولاتیەکی چینی ناوەراست لە پێگەی ستوونی رۆحیەتی رۆشنبیری و کلتوورییدا هەنگاو دەنێن لەناوەخۆ بەرووی جیهان واتە بیرکردنەوەی دێهات نەوەك شاری بەهزری دەرەکی، لەوانیە کاریگەری کلتوری بیانی بەسەرناوەخۆی هەبێت بەلام ئەم جۆرە کلتورە بۆێمە دووبارە ریفۆرمی دەکەین و وەبەرهێنانی ناوەخۆی پێدەکەین تاکو لەداهاتوو هەرێم و کوردستان نەکەوێتە دەستی شاراوە. هەنگاوی ئێمە لە هەولێر لەرەگەزی نێر و مێ کەوا دەبینم بۆ دامەزراوەی شیکاگۆیەکی نوێیە نەوەك کۆنەپەرستی و دەرەکی بێت.

شیگاگۆ هەمان چارەنووسی منی هەبوو لە قۆناغی سووتان لەناوەخۆی سالی 2024 بەلام هەولێر ناسووتێت بەلکو خۆی دەشوات بە ئاگر تاکو رزگاری بێت لە چینی شل لەناوەخۆی ئاستی بەرزونزمدا بۆیە هەولێر وەك شیگاگۆ دووبارە ناوەندێکی رۆشنفکری جەماوەریە لە سەردەمی دلداری شاعێری تا ئێستا و داهاتووی بەردەوامدا. هێزی ئەمەریکا لەم رۆمانە تەنها بردنی عقلی خەلك و نمایشکردنی بەرهەمی عقل و هزرەکان لە بازارێکی ئازاد وەك بەهەشتێکی سەرووی زەوی لە پرۆسەی هەوسبازی و خواردن و خواردنەوە و داهێناندا. واتە ئازادی تاك لە رۆح و هزر و جەستە جۆرێکە لەئابووری مرۆی زانستی لە پێگەی جیهاندایە. حەزدەکەم رۆژێك سەردانی ئەمەریکا بکەم وەك گەشتیارێك لە نزیکەوە تێکەل بەرۆحی کۆمەلگای ئەمەریکابم و بزانم مێگا پرۆژێکت و ئابووری مرۆی زانستی لەسەر چ لۆژیکێك دامەزراوە، ئایا هەمەرەنگە یان رەسەنایەتی ئەمەریکایە؟

ئەگەر کاتتان هەبوو ئەم رۆمانە بخوێنەوە، چ پارادۆکسی هێشتنەوەی ئەمەریکا لە رۆژهەلاتی ناوەراست و ناوەخۆی و جیهان، یاری مەرگ دەکات بەناوی (هێشتنەوە لە مەچورووتی)دا.

# کەوتنی کۆمپرادۆری سیاسی لە باشوور

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : داهاتووی مرۆڤ
بەروار : 25 جوون 2024

تەمەنم بوو بە 41 سال کە بەجیلی ئالتوونی دەناسرێن و زۆرترین ناخۆشی نەتەوەی و سیاسی و ئابوری و مرۆیمان بینیوە وەك گورگی باران دیتە هەروازونشێومان بریوە هەر کۆلمان نەداوە بەردەوام بووینە، ئەوەی زۆر بەدوای دەگەرێم جۆرێکە لە دۆزینەوەی دەرەزی ترسی رووخانی حیزب و حکومەت و خێزان و کۆمپانیا و جەماوەرە، بەهۆکاری درێژونەوەی تەمەن و بچووك بوونەوەی قەبارە و پێگە و رووخانی لەسەرخۆ لەناوەخۆی هەرێم و دەرەوەی کوردستان، لێرە باسی هەلسانەوەی حیزب ناکەم چونکە جیهانی سەرمایەداری بە لۆژیك دۆخی ناوەخۆی هەرێم لە سەردەمی پراگمات کردیە خالی وەرچەرخانی (فریودانی هەرێمی باشوور) لە پێگەی جوگرافیای سیاسی و ئۆتۆنمی سەربەخۆ لە سێبەری ناوەندی پێکهاتەی نەتەوەی (فیدرالی و دەستووری). لە هەنگاوی دووەم توانرا ئابووری مرۆی هەرێم بروخێنن بەرێگای مشەخۆری ئابووری هاوردە و مووچوخۆری کە ستوونی رووخانی ئەم حیزب و حکومەت و جەماوەریە، چونکە خواستی داهاتوو دەبێتە ئازادی گیرفان لە هەلبژاردنی (حیزب و دەنگ و شوێن و هێز) ئەم چوار پاکێچە بەهاونرخی تەنها لەگیرفانی تاکەکان بەگوێرەی زیرەکی خۆشگوزەرانی دەروونی بەدەوری ئەم ژیارە دەخولێتەوە و بەشێکە لە ئابووری بەکاربەری کۆمپرادۆری، لێرە پێگەی حیزبی کلاسیك لە نوێبوونەوە و داخزان بەردەوامە بەلام ناتوانێت رێگاکان بدۆزێتەوە و کۆدی سەرکەوتن بشکێنێت و دووبارە بەهێز و قورسای و پێگە بگرێتەوە ناوەخۆی پەرلەمان و دامەزراوەی حکومەت و ئاراستەکردنی کارنامەی حیزبی خێزانی بەسەر مایکرۆجەماوەری و دەرکییدا.

دلم زۆرخۆشە کاتێك ئایفۆن و ئۆتۆمبێل و سۆراو سپیاو صەندەویچ و مۆدێلی شاز شاز لەبازاری هەولێر و کوردستانی باشوور لەگۆرانکرای خێرادایە کە خواستی ئازادی هەلبژاردنی گیرفانی بەکاربەر وەك بینەرێکی دەنگدەری حیزب و شوێن و هێز و دەنگە بۆ هەلبژاردن و پێدانی نرخ و بەها بەم کالایانە، واتە ئەم پاکێچە ئازادییە خواستی زیرەکی دەروونی و دۆزینەوەی ئابووری خێرایە لە ماوەیەکی دیاریکراو درێژمەودایە، لە رۆمانی شیکاگۆ دەلێت، ئابووری ئەمەریکا ئەوەندە بەهێزە بەردەوام چینی هەژار لە سیستەمی نیولیبرالی جۆرە بازارێکی هاوبەش هەیە بەناوی (مۆدێلی بەسەرچوو) واتە نرخی ئەم کالایانە هەرزان و نوێیە بەلام لەگەل شارستانیەتی ئەمەریکا سەردەم ناگونجێت بۆیە (هەراج دەکرێت و بۆشای هەژاری پردەکرێتەوە). ئەم دەقە رۆمانە بەرچاوروونی دەخاتە هزری خوێنەر کە ژیانی داهاتوو خێرا و لە گۆراندایە هیچ شتێك هێز و قورسای و مێژووی نامێنێت بەلکو دەبێتە بەکاربەری رۆژانەی خواستی ئابووری سەرەنجراکێش لە جیهاند بەهۆکاری هاوردەی ئەم مۆدێلانە لەناوەخۆی وەلاتانی سێیەم و دووەم چونکە ئابووری پیشەسازی داهێنراو بۆدوادوە ناگەرێتەوە بەلکو لەبەردەوامی نوێبوونەوە و خێرای و کوالێتی و ئازادی هەلبژاردن و نرخی ناوگیرفانی بەکاربەر دەردەخات تاکو ببێتە کریاری بەردەوامی جیهانی نوێبوونەوە لە سەرمایەداریدا.

لێرە سیستەمی کۆنەپەرستی واتە (نەتەوایەتی) لە پێگەی لۆبی و دەسەلاتی سێبەری کاپیتالیستی هیچ بەهاو نرخی نیە بەلکو بەردەوام کێشە و ئاژاوەی ئابووری سیاسی دەخاتە ناو پرۆسەی جیهانگیری ئابووری بەهۆکاری دواکەوتوو و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری و بێکاری و سەرباری شکەستی حیزب لە پێگەی دامەزراوەی حکومەت و جەماوەردایە، بۆیە هەنگاوی داهاتووی هەرێمی باشوور هیچ کارتێکی لەدەست نماوە تەنها خۆهەلواسینە بە کێشەی پرۆژەی 11ی سێپتەمبەر بەناوی هاوئۆپۆزسیۆنی دژە

(هزری توندڕەوی لە ئایند). ئەم کارتە بەسەرچووە چونکە گروپی بریکس دژی ئەم ڕوانگە کاردەکەن بۆ هەڵسانەوەی بۆشای ئاسایش و خۆراك و ئابووری مرۆی و دامەزراوەی حکومەتێکی جێگری و متمانە لەنێوان کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال دیموکراسەکان کاری بۆدەکرێت. بۆیە ئەو قیژەی هەڵبژاردن و دواخستنی حکومەت و پەرلەمان و ئاژاوەی سیاسی و ئقلیمی هیچ لە بابەتەکە ناگۆرێت تەنها درێژکردنەوەی ماوەی دواخستنی حکومەتی نوێ و دامەزراوەی پەرلەمانی فرە ڕەنگ و سەرەوەری خاکی هەولێرە لەگەل بەغدا بەکێشەی لاوەکی و دەرکی درێژە بەمانەوەی خۆیان دەدەن لە چوارچێوەی (هەستی دەروونی نەتەوایەتی و پێشخستنی کەرتی شارەوانی لە پێش ئەم هەڵبژاردنەدا). دلنیاتاندەکەمەوە لە چین و توێژی گەنج، ئەم حکومەتە نیشانەی پرسیار و لاوازی پەیوەندی سیاسی و ئابووری و سەربازی پێوەدیارە بەلام بەهۆکاری بۆشای نێوان 4 ولات، حکومەتی هەرێمی باشوور لە سێبەری ناتۆ و ئەمەریکا بەرێوەدەچێت تاکو عێراق نەرووخێت و دەرفەتی هاتنە پێشی گەنج و هێزی سیاسی دەرەخسێنێت لەناوەخۆی ئەمەریکا بەهاوکاری بەغدا، تاکو باشوور ڕزگاری دەبێت لەم دواکەوتووە شارستانی و سیاسی و جەماوەرییە.

ئەوەی من زۆر لێیدلنیام گۆرینی هەرێمی باشوورە لە حیزبی و کۆنەپەرستی بۆ شارستانی و دیموکراسی بەهاوکاری بەغدا و واشنتۆن ئەم پرۆژە دەچێتە بواری جێبەجێکردن لە دامالینی چەك و گۆرینی حکومەت بۆ ئۆپۆزسیۆن و گەراندنەوەی سەروەری حکومەت لەپێگەی هاولاتی و دورخستنەوەی حیزب و خێزانی حیزب و کۆمپانیا بۆ نوێبوونەوەی ریشەی دوور لە کۆنەپەرستی و ناسیاسی و ئاژاوەی تێکدانی دیموکراسی و بازاری نیولیبرالی. ئەوەی گرینگە حیزبی کلاسیك و مایکرۆجەماوەری ناتوانن خۆیان ریفۆرم بکەن بەهۆکاری هەبونی دەنگی خێزان و رێبەرایەتی خێزان بەسەر حیزب، دووبارە بەهەر گۆرانکاری لەناکو لەناوەخۆی حیزب و جەماوەر ستوونێك لە تەمەنی ئەم جۆرە سیستەمە کلاسیکە دەبێتەوە بەرەو لاوازی دەروات، ڕێژەی تاوانی مێژووی و شەکەستی دامەزراوەی حکومەی و ئاراستەی دەسەلاتی خێزان بەسەر حیزب و جەماوەر حکومەت زالە. لێرە هیچ ریفۆرم پێشهاتەکان فریار ناکەوێت بە ئەگەری ئەم دۆخەی هەڵبژاردن و مانەوەی خۆیان لە هەرێم و پۆستەدا.

یەکەم : ناتوانن تاوانی ڕابردوو پاك بکەنەوە بەئەگەری گۆرینی کادیر و جەماوەر ولایەنگری حیزب چونکە تۆماری ڕۆژانەی تاوان و هەلە و مکوڕی، سەرجەم حیزب و مایکرۆجەماوەری لە داتای سیاسی تۆماکراوە وەك نازناو و پێگە لە داهاتووی بەردەوام مامەلەی پێوەدەکرێت و نیشانەی پرسیاری لەسەرە.

دووەم : جۆرێکە لە خەشیمی سیاسی واتە نەبوونی ڕۆحەتی سیاسی لەناوەخۆی هەر حیزبێك وەك وێنەی ڕۆمانی دێلەگورگێکی خۆشەویستی و کتێب، دێتەبەرچاو کە دەڵێت هاوسەرگیریمان بریتی بوو لە کۆنتراکتی بەکرێدانی جەستە. لێرە ئەندام و لایەنگر و سەرکردایەتی وەك ئەم گرێبەستە جەستەیە وایە بۆ پەرینەوەی حیزب و خێزان و کۆمپانیا لە چوارچێوەی سیستەمی دەستەی پۆلیسی ئەندامانی حیزب و جەماوەر و سەرکردایەتی خۆی نمایش دەکات بۆیە بەردەوام لەگۆڕان و وەص وەصە و کورتهێنان و درێژەدادڕی ئاژاوەی سیاسی دەخولێتەوە. هەمان گرێبەتی بەکرێدانی جستەیە ئەم مۆدێلە حیزبانە لە باشوور هەیە.

دەسەلاتی کۆمپرادۆری و پراگماتیستی لە هێزی حیزب و مایکرۆجەماوەری کەوتونەتە بەرلێشاوی لەناوچوونی لەسەرەخۆ بەهۆکاری لەدەستدانی ئابووری (دیجیتالی و کارنامەی سەوز و ئۆتۆمبێلی خۆرێبەری و داهێنان لە پیشەسازی) هەرێمی باشوور هیچ لەمانە بۆی بەرێوەناچێت و هیچ پشتگیری ناوەخۆ و دەرەکی نیە بەهۆی ئێکسپایەربوونی خەباتی نەتەوپەرستی لە جەستەی ئابووری نیولیبرالی چاخی دیجیتالی دا. جیهانی داهاتوو تەنها گەنج و هێزی بەکاربەری ڕۆژانەیە لە خۆشگوزەرانی و ئاسایشی خۆراك و دامەزراوەی و گەشەپێدانی دیموکراسی و ئایدۆلۆژی و دۆزینەوەی وزەی نوێ بەرێوەدەچێت. وە جیهانی کۆمەنیستی نوێ کار لەسەر نوێبوونەوەی ئابووری و سیاسی و مرۆی و ژینگەی دەکات بە پێچەوانەی ئابووری نیولیبرال دیموکراسی. هەرچەند ئەم حیزبانە پێدەخەنە ناو ئەم دوو جەمسەرە بەلام هیچ سوود و قازانجی نیە، لەبەر ئەوەی تەمەن و کات و هێز و پێگەیان بەسەرچووە بەهۆکاری نەبوونی ستوونی (کلتور و هزر و داهێنان و بەکاربەر) ئەمە هۆکاری مانەوەی هەرێم و دەولەت و حکومەتە. کەچی هەرێمی باشوور لە مشەخۆری و کۆمپرادۆری و خەشیمی سیاسی و هاوپەیمانی، هیچی بۆنەمایەوە سەرجەم کاروچالاکی بوون بە سناپی هەوالی زبلدانی دیجیتالی لە چاوتروکانێك دێن و دەرۆن ئەم جۆرە خەباتە وەك بێ هۆشکردنی خەلك و حکومەتە لە پرۆسەیەکی نائابووری مێگاپرۆجێکت دەخولێتەوە بەناوی ئابووری لاواز و داتەپیو.

کۆمەلگای باشوور لە پرۆژەی (بەفیرۆدانی مرۆڤ) بەرێوەدەچێت واتە لەسەرجەم سێکتەری گشتی سیاسەتی حکومەت لە دامەزراوەکان بە لاوازی ڕاگیراوە بەهۆکاری نەبوونی سیاسەت و متمانە بەمانەوەی باشوور و بەرژەوەندنی خێزانی لەبەردەم چارەنووسی ئۆتۆنۆمی چونکە لە گرێبەستی بزوتنەوەی پارتیزانی شاخ لە سەدەی 20 گفتێکی سەرەتایان پێدراوە بە ڕادەستکردنی

باشوور بۆ ژێر ئیمپراتۆریەتی زایۆنی و پرۆژەی ئیبراهیم بۆ ئاشتی. بۆیە رووسیا و ئێران و توركیا و سوریا رێگری لەم پرۆژەیە دەكەن بەئەگەری لە دەستدانی سەروەی و خاك و نەتەوە لە ناوەراستی ئاسیا و باشووری. دۆخی باشوور لە جیهانی ئەقلیمی لەبەردەم ئەم پۆژانە دەوردراوە كە بۆ گەراندنەوەی سەروەری عێراق و نەهێشتنی تیرۆر و دامەزراندنی پرۆژەی گەورە و دوور خستنەوەی عێراق لە دابرینی ئبراهیم بۆ ئاشتی كە سەرجەم ئابووری كۆمەنیستی نوێ قوفلێكی جیۆسیاسی لە ناوەخۆی عێراق و پشتگوێخستنی هەرێمی باشوور دەخرێت.

## پرۆژەكانی سنووری عێراق.

**1- پرۆژەی هێلی ئابووری بەناوەخۆی عێراق بۆ سەرجەم شاروشارۆچكەكان پەرینەوە بۆ دراوسێیان جگە لە هەرێمی باشوور.**
**2- پرۆژەی فاو بۆ رێگریكردنی لە ئیمپراتۆریەتی زایۆنی بۆ سنووری یەكێتی سۆڤیەت و قوفلدانی پەرتەوازەی كوردستانی گەورە.**
**3- پرۆژەی ئێران بۆ ناوەخۆی عێراق و بوژانەوەی سووریا.**
**4- پرۆژەی صین لە ئاسیا بۆ كەنداوی عەربی و ولاتانی دراوسێ.**
**5- پرۆژەی هند بۆ كەنداوی فارس و عەرەبی.**
**6- پرۆژەی برێكس لە پێگەی بووژانەوەی رووسیا و بەبازاركردنی صین لە رۆژهەلاتی ناوەراست.**

سەرجەم ئەم پرۆژانە، هەرێمی كوردستانی باشوور لێدەرخراوە لە گۆشەی سیاسی و ئابووری لە قالبێكی سركردن جێگربووە. هۆكاری دەركردنی هەرێم بەهۆی پێگەی ناتۆ و ئەمەریكا لەناوەخۆی هەرێمی باشوور بۆ ئاژاوەی سیاسی و دۆلار دیبلۆماسی و پرۆژەی تیرۆر و جەنگی پرۆكسی و پەككستنی باشوور لە چوارچێوەی عێراقدا. جیهانی برێكس و ئەقلیمی هەولێكی زۆر دەخاتە گەر بۆ گۆرینی ئەم سیستەمە سیاسییە لەناوەخۆی باشور تاكو بەرێگای بەغدا ریفۆرمی ناوەخۆی بكات و هاوسەنگی بۆ عێراق بگەرێتەوە لەپێگەی خالی ناوەراستی عێراق بۆ ئەوروپا و رۆژهەلاتی ناوەراست و ئەفریقا ببەسترێتەوە. برێكس كۆتای بە بۆشای تیرۆر و هەژاری و گۆرانی كەشەوهەوا و ئابووری هاوردە و دژ بە ج7 كاردەكات وە بەپێچەوانەوە 7ج هەمان تێروانی هەیە بۆ لەناوبردنی سیستەمی سیاسی كلاسیك بۆ نوێبوونەوە لە هێزی رۆشنبیری و شارستانی دوور لە كۆنەپەرەستی نەتەوەی. ئەمە دەرفەتێكە بۆ ئێمەی گەنجانی كوردستان بتوانین فشاری هزری لەرووی رۆشنفكری بخرێتە سەر ئەمەریكا و رووسیا تاكو باشوور لەم جۆرە حیزبانە رزگاری بێت و بەجارێك لە پێگەی نەتەوەی بگۆرێت بۆ نیشتیمانی دوور لە پێكهاتەوە و ئاین و خاك بەلكو بەرێگای دیموكراسی و گۆرینی زۆرینەی دەنگ لە پەرلەمان دەبێتە ریفۆرمكردنی ناوەخۆی هەولێر بەسەر بەغدا و دراوسێیان.

بەرزكردنەوەی ئاستی رۆشنفكری تاك لە پێگەی خێزان و جیهانی چاخی دیجیتالی دەبێتە داتای جیۆسیاسی لەناوەخۆی كوردستانی باشوور و جیهانی ئیمپرالیزم ئەوكات بەئاسانی لێكتێگەیشتنی كلتوری بەرێگای رێكخراوی جیهانی لە نێو چینی و توێژی نێرومێ هەنگاوێكی جیاواز دەخاتە ناو جیهانی سیاسی، خۆشبیەكەی ئەوەیە ئەم حیزب و مایكرۆحیزبیانە بەردەوام داخزانی بۆ هەموو شوێنێك بەرێگا نوێنەری و نێردراوی پێش خەلكی باشوور دەكەون بەلام داتای دیجیتالی ناوەخۆ دیوێكی شاراوەی لەبەردەم ئەم سەردان و گەشت و نوێنەرایەتیە دەردەخات كە بەهاو و نرخی ئەم سەردەمەی باشوور چۆن و چی یە لە چ ئاستێكە بۆیە بردنەوەی داهاتوو بۆ ئێمەی گەنجە بەرێگای بەشداری سیاسی و پەرلەمان و بلاوكراوەی كلتوری و بەرێگای جیهانی سۆشیالمیدیای دەبێتە درزێكی گەورە لەناوەخۆی باشوور، خەلك رزگاری دەبێتە لە خەباتی (گۆرستان و نەتەوەپەرستی و ئاینی تەكیە و دیوەخان و قەلەم كوتان).

زۆرگەشبینم نەوەی داهاتوو رزگاری دەبێت لە ئاژاوەی سیاسی ناوەخۆ و دەرەكی بەهۆكاری جەنگی پرۆكسی و ج7 لەناوەخۆی عێراق و رۆژهەلاتی ناوەراست. ئێمەی گەنج بدۆرێن و ببەینەوە هەر قازانجمانە چونكە برێكس و ج7 ترسیان لە خەلكە نەوەك حكومەتی هەرێمی حیزب و مایكرۆجەماوەریەكان. ئەم رۆیتانە هەیە بەردەوام سەردان و كۆبوونەوە و پەیوەندی دبلۆماسی ئەنجام دەدرێت و لە میدیای ناوەخۆی دەركرێتە مانشێتی گەورە بۆ گەراندنەوەی دەنگ و پێگەی خۆیان، بەلام لە دیوی شاراوە سەرجەم هێزی دەرەكی چاوەروانی گۆرانكاری ئەم دۆخن بۆ ئەوەی وەكوجاران پێشوازی لە حكومەت و پەرلەمان و سیاسەتی جەماوەری مەدەنی بكەن لە هاوكێشەی جیۆسیاسی كوردستان و عێراق.

گرینگ نیە رۆژانە وەفدی ئەرووپی و ئاسیای و ئەمەریكی و عەرەبی سەردانی ناوەخۆی هەولێر دەكەن دەبێتە پروپاگەندی میدیای حیزبی بێ ناوەرۆك. ئەوانیش وەك خەلكی كوردستان چاوەروانی ترازانێكی ریشەی لەناوەخۆی كوردستان دەبینن، ئەگەر ئورشەلیم بۆ

بەرژەوەندی خۆی بەهاوکاری ئێران و تورکیا ئەم حکومەتە و حیزبانە رابگرێت بەلام دۆخی داهاتووی جوگرافیای ئابووری سیاسی سەرجەم بەستەلەکان دەتوێنێتەوە لەناودەبات. دلمان خۆشە خەباتی پراگماتی لە سەدەی 20 لەناوەخۆی کلاسیکی نوێبوونەوە، دەتوێتەوە بەهۆکاری گەشەی جیهانی لەرووی مرۆی و خێرای زانست و نەمانی هێزی کلاسیك بۆ ئولترامۆدێرن. ئەوکات ئەم زلهێزانە فریای مانەوەی خۆیان دەکەوەن نەوەك راگرتنی حکومەت و حیزب و جەماوەری لەباشوور.

دلتان گەورەبێت بە هیمەتی گەنجان و خەلکی کوردستان دۆخی ناوەخۆی باشوور بۆ هەتا هەتای دەگۆرێت و هەلدەوەشێتەوە بۆ نیشتیمانی مۆدرنێتە دوور لە کۆنەپەرەستی نەتەوەی و ئاینی و خێزانی. بردنەوەی ئەم هەلبژاردنە گۆرانکاری 360 پلەی لە دۆخی ناوەخۆی هەرێمی کوردستان دەکات. بەشدار چالاکی رۆژانەت بکە لە رووی بلاوکراوەی کلتوری بەرێگای ئەکاونتی خۆت و پێگەی دەنگت لە ئێستا بۆ داهاتووی بەردەوام. جیهانی ئێستا ترسی لە خەلك نەوەك (حکومەت و حیزب و پارە و چەك) چونکە ئەم چوار شتە لە کۆمەلگا شەرعیەت وەردەگرێت و دادەمەزرێت بۆیە براوە بۆ گەنجانی کوردستانی باشوورە بەسەر نەیاران و تێکدەرانی جیهانی شاراوەیە لەناوەخۆی کوردستان. بخوێنە و بنووسە و ئەگەر نووسین و وێنە و گرتەی ڤیدیۆ و تۆماری دەنگی لەسەر قاپە برنجێك بوو بلاوی بکەوە گرینگە ئەوەیە هێزی رۆشنفکری و کلتوری بەسەر ئەمەریکا و رووسیا زال بکەین و ناچار بە گۆرینی ئەم دۆخەیان بکەین.

**مەترسن ئەگەر ناوتان خرالیستی داواکاری ناتۆ و ئەمەریکا هەر قازانجی مردنی ئێمەیە لەسەر نووسین و گۆرینی کوردستانی باشوور گەواهیدەری رووخانی خۆیانە، لە رووخانی مصر سەرجەم قوتابیانی قپتی لە ئەمەریکا خرا لیستی تیرۆر و تێکدەر لەدوای لەناوبردنی چینی رۆشنفکران، مصر لە پێگەی هەوالگری هاوپەیمانی ئەمەریکا بە شەق و شاپی جەماوەری لە مەیدانی قاهیر ئالوگۆری دەسەلات کرا و تەختی شاهانی رووخا. ئێستا نە ئەنقەر و نە تەهران بەفرمی پشتگیری خەلك دەکەن نەوەك ئەم دۆخە سیاسیەی لەناوەخۆی باشوور هەیە بەناوی حکومەتی دوو حیزبی و پاشکۆی مایکرۆ جەماوەری.**

جیهانی رۆشنبیری لەگەل نوخبەی خەلکی کوردستان و دژ بە حکومەت و حیزب و مایکرۆجەماوەرییە. بۆیە دەنگی ئێمە بە یەك تویت و پۆستی فەیسبوك بە هەرزمانێك بێت دەبێتە هزری پەتی کوردی لە ناوەخۆی دژ بە چەقبەستووی ئەم بارودۆخە. ئێمە هەر براوەین، ئەمەرۆکەبێت یان دوو بەیانی کوردستان دەگۆرێت لەرەگەوە دەکەوێتە بەرلافاوی جاچی دیجیتالی زیرەکی خۆرێبەری. سلاو لە کوردستانێکی بەهێز دوور لە خەباتی پراگماتی خێزانی و مایکرۆجەماوەری.

# کورد ناتوانێت ناوبژوانی سیاسی بکات!

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : داهاتووی مرۆڤ

بەروار : 26ی جوون 2024

ئەمڕۆکە لە میدیای باڵی حیزبی وەك سەردێری هەواڵەکان جۆرێك لە نمایشی پێهەڵدانی کەسایەتی لە قەڵەمی نووسەرێکی بیانی، باس لە کەسایەتی و سیاسی لە پرۆژەی ناوبژوانی ئاشتی و جەنگ لەرۆژهەڵاتی ناوەراست وەك (دەبدەبە) فویان لەناوی دەکرد بە ئاسمانی هەرێمی کوردستانی باشوور نمایشدەکرا، وەك جۆرێك بوو بۆ گەوجاندن و زیندوکردنەوەی کەسی و پێگە و باڵ و سەرەنجێکی پروپاگەندەی بۆ گەرمکردنەوەی نازناوی ئەم پێگەیە بە ئاراستەی دۆستایەتی و بەخشین و گیرفان گەرم کردن جۆرێك لە ناوەخۆی نووسەرانی سەربەخۆ کە بەشێك لە لۆبی و حەوزی بیرکردنە و کۆنە مارێنز و میدیاکار ئەمانە بەردەوام بەدەوری پارەی خێرا و کۆمەڵگای چەقبەستووی دەخولێنەوە بۆ بەدەست هێنانی پارەو پێگە و بلاوکراو و پۆست بەرێگای ئاراستە و پشتگری دیجیتالی لە نووسراوەکانیان بەزمانی بیانی بەشان وباڵی حکومەت و حیزب و خێزانی هەرێمی باشوور وەك شاباشێك بەدیجیتالی دەکرێت.

ئەم جۆرە کردارانە لە زمانی سیاسی پێی دەڵێن (گەرانەوەی دەرگا) بۆوێنە من وەك جەودەت احمد لە کاتی نووسراوی ستوونی و جیاواز دەتوانم بۆلایەنێك بنووسم و پشتگیری بکەم وەك ئۆپۆزسیۆنی سەربەخۆ لەپێگەی کەسی و پەیوەندی نووسراوی ناوەرۆکی دیجیتالی، یان کەسێکە لە پێگەی سەربازی بەرزدایە لە دوای خانەنشین دەبێتە کارمەندێکی راوێژکاری سەربازی لە پیشەی شیکرەوە و ستوون نووسی بە پارەیەکی کاش کە بەئارەزووی دەسەلات و حیزب بۆی بنەخشێنێ، ئەم جۆرە پۆستانە لەناوەخۆی ئەمەریکا و ئەورووپا باوە کاتێك تەمەنی ناوەند دەبێتە هۆکاری لە دەستدانی پیشە و بێ توانانی بەناچاری وەك کرێکارێکی شیکەرەوەی لە پۆستی خۆی پشتگری ئەم لایەنگرە دەکات بە گوێرەی رووداو پێشهاتەکان بەرچاوروونی و هۆشداری دەخاتە بەردەم حیزب و حکومەت و خێزان. بەم جۆرە کارانە دەڵێن (لۆبی ئێکسپایەر) واتە پشتگیری بەسەرچوو لە جوگرافیایەکی پیشەسازی و زلهێزیدا. زۆربەی کەسایەتی ئەمەریکا کە ئەم جۆرە کارانە دەکەن، لە میدیای حیزبی بە شاگەشکەی پێداهەڵدان و بریقەداری بۆدەکرێت. بۆیە ئەم جۆرە کارانە تەنها جۆرێکە لە ژانە سەری سیاسی و مەترسی کەوتن و دوورخستنەوەی لە پێگەی جەماوەریدا. ئەمە ئاساییە رۆژانە لە کۆمەڵگای دواکەوتوو و نەخوێندەوار و ناشارستانی ئەم جۆرە یارییە سیاسیە ئەنجام دەدرێت تەنها بۆ پیشاندانی دیوی ناوەخۆی حیزب لە جیهانی میدیای سیاسی و ناوچەگەریدا.

ناوبژوانی سیاسی کێ یە کە رۆل دەگێرت لە بەیەکگەیاندنی دوو هێز و دەولەت و هەرێم و مایکرۆ جەماوەری و حیزبی؟ زۆربەی ئەو ولاتانەی ناوبژوانی سیاسی و نوێنەری دەکەن خاوەنی ئابووری سەربەخۆن لەرووی وەبەرهێنانی ناوەخۆ و پیشەساز و هەناردەی، لێرە لە کاتی ناوبژوانی بە ئاسانی ئەم کەسایەتیە دەتوانێت لە پێگەی هێزی ئابووری خۆی لەرووی جوگرافیای ئابووری سیاسی، خالی لاواز و بەهێزی ئەم دوو لایەنە دیاری بکات لە پێگەی هاوبەشی و دبلۆماسی خۆی، بۆیە بەئاسانی راپۆرتی ئابووری و سیاسی و دیبلۆماسی و سەربازی و مرۆی و سێکتەری گشتی هەردوو لا ئامادە دەکرێت بە ووردی لەدوای چەند هەفتەیەك لەبەردەم کەسی سیاسی و نوێنەری دادەنرێت بەهاوکاری راوێژکاری پیشەی و زانستی کە لایەنی باش و خراپی ئەم بەیکگەیشتنە لە بەرژەوەندی خۆیان و دوولایەن دەبێتە نوێنەری ئەم دوولایەن کە رۆل دەگێرت لە چارەسەری (جەنگ وئاشتی) دەخرێتە بەرباس.

زۆرم لا سەیرە هەوالخوێنەرێك شاگەشکەی ئەم جۆرە لێدوانانە بێت بلێت کەسایەتی کورد لە پێگەی ئاشتی و جەنگ لە رۆژهەلاتی ناوەراست وەك چارەسەری نوێنەرایەتی کێشەی بەستەلەکی رۆژهەلاتی ناوەراست بکات؟ ئەم جۆرە لۆژیکە بە چ ئەگەرێك کورد دەتوانێت چارەسەری بکات، سیستەمی زلهێزی و ئیقلمی، ناوبری جەنگی مانەوەی هەیە لەسەر پێگەی (هاوپەیمان و ئۆپۆزسیۆن و جوگرافیای سیاسی) قەبارەی دانیشتوان و حکومەت و دامەزراوە و دەنگ و خاك دیاری دەکات چۆن هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی لاواز رۆلی ناوبر سیاسی بگێرێت؟

کورد چ جۆرە رۆلێکی هەیە لەم رووەوە بۆ چارەسەری جەنگی پرۆکسی و ئاشتی؟ من دەڵێم هیچ! چونکە هەرێمی کوردستان خۆی کێشەی ناوەخۆی و ئقلیمی و جیهانی هەیە چۆن دەتوانێت کێشەی دەرەکی چارەسەربکات؟ بە چ لۆژیکێك ئەم جۆرە مانشێت و بلاوکراوانە دەرخواردی کۆمەڵگای کوردی دەدرێت. ولاتی هند لە پێگەی زلهێزیدایە لە دوای یەك مانگ بە کۆمەڵێك راپۆرت و راوێژکار و میدیای ناوەخۆی ئەوکات دەتوانێت ئەم جۆرە هەلوێست و گەشت و لێدوان و سەرکێشیە ئەنجامبدات. قەبارەی دەولەت جیایە لەگەل هەرێم، چونکە جولەی سیاسی و ئابووری و سەربازی لە پێگەی سەرکردەی هەر ولاتێك کاریگەری ئەرێنی و نەرێنی لەسەر جوگرافیای سیاسی دەبێت سەرباری دەغ دەغەی میدیای و گۆرانکاری جوولەی هەوالگری لەم جۆرە جەنگ و ئاشتیەدا.
**دوێنێ بوو باشووری کوردستان لەسەر مێزی تەهران کۆبۆو و ناوبری سیاسی ئەنجامدا لەناوەخۆی باشوور.**

کورد لەژێرپرسیارە لەرووی سیاسی و ئابووری و سەربازی لە چوارچێوەی نەتەوەی و خۆرێیەری چونکە ناتوانێت بەبێ ناتۆ و ئەمەریکا و ئقلیمی رۆل بگرێت هەر لە ئەزەلەوە هەرێمی باشوور لە سەر پاشماوەی حکومەتی بەعث دامەزراوە لە دامەزراوەی حکومی و کارگێری واتە قەبارەی هەرێم و ئابووری مرۆی ناتوانێت رۆلێکی پەتی و بەرهەمداری ناوەخۆی بگرێت لە خۆرێیەری و دامەزراوەی بۆیە ناتوانێت رۆلی دەرکی هەبێت، لەوانیە وەك نامەبەر رۆل بگرێت بەلام لە چوارچێوەی نێردراوی ئەم دەولەتە (چی پێوتراوە ئەمە بگەیەنێت). ناتوانێت وەك رووسیا و ئەمەریکا و صین و ئەورووپا ناوبژوانی سیاسی بکات، ئەگەر دلسۆزی سیاسی بەکاربهێت لە پێگەی پشتگیری مرۆی وەك هاوسۆزی و یارمەتی دیاریکراو بۆ نمایشی سیاسی لە ئامادەبوونی قەوارەی هەرێم لەم پێگە سیاسیەدا دەبێتە کردارێکی رەمزی و وەفای نەوەك زلهێزی و دبلۆماسی لە ئاستی ناوبری جەنگ ئاشتیدا.

## شیکردنەوەی ناوەخۆ لە پێگەی ناوبژواندا چی یە؟

1- ئابووری هەرێم هاوردەو کۆمپانیا رۆل دەگێرت بەردەوام لە مشەخۆری کۆمپرادۆری لەنێوان خەلك و خالی وەرگری ئابووری جیهانگری دەخولێتەوە بە هەرێمی سێیەم هەژماردەکرێت لە هەژاری و ئابووری مرۆی و نەبوونی پرۆژەی مێگا پشەسازی ناوەخۆی هەرێم، سامانی سروشتی لە کێشەدایە و زەوی و نیشتەجێبوون و مایکرۆکشتوکال و لاوازی گەشتیاری و داهاتی ناوەخۆی دەخولێتەوە. واتە نیشانەی پرسیاری لەسەرە بۆ ناوبژوانی.

2- سیستەمی سیاسی خێزانی و مایکرۆ جەماوەرییە واتە مەودای سیاسی لەدوو زۆنی پەرتەوازی ناوەخۆی هەولێرە و بەغدا دەخولێتەوە سەرباری کێشەی سنووری و نەوت و بودجە و دەستوور هی تر، ئەمانە لەناوەخۆ بویتە کەلکەلەی سیاسی لەگەل بەغدا و ئقلیمی و زلهێزیدا، کەواتە کێشەی جیۆسیاسی ناوەخۆ لە ئاستی دەرەکی پێگەی لاواز لە دواکەوتنداییە تابتوانێت رۆلی ئاشتی و جەنگبگرێت لەناوبژوانی سیاسدا.

3- سوپایەکی فەرمی نیە کە هاوشانی ناتۆ و ئەمەریکا و عێراق و ئقلیمی دامەزرابیت بەلکو هەرەمەکی و میرنیشینی و خێزانی و حیزبی و کەسییە، مەودایەی هێزی سەربازی تەنها لەزەوی رۆلێکی دیاریکرا و هاوبەشی دەگێریت نەوەك فۆرمێکی تایبەت و فەرمی هەبێت، سەرباری کێشە ناوەخۆی عێراق و دراوسێیان لەگەل پێکهاتەکاندا. ئێستا لە رووی لۆجستی و راهێنان و هاوالگری پشتگری هەرێم دەکرێت.

4- لەرووی هەوالگری لە دوو زۆن پێکهاتەوە کە جێگای تێرامانە بۆیە لە ناوەندی هەوالگری و ناوەخۆی ناتوانێت زانستیانە ناوبژوانی ئاشتی و جەنگ بکات چونکە خۆی لە ژێردەستی فیدرالی و ئقلیمی و جیهاندایە.

**بەکورتی هیچ هێزێکی هەرێمی ناتوانێت رۆلی ناوبژوانی سیاسی هەبێت بۆ جەنگ و ئاشتی ئەگەر لە پێگەی بەرزدانەبێت. کورد کێشەی سێ شاری پێچارەسەرناکرێت چۆن رۆلی ئاشتی و جەنگ دەگێرت لە رۆژهەلاتی ناوەراست؟ ئەمە پارادۆکسە و خالی خۆلەمێشییە واتە هەرێم خۆی کێشەیە بۆ جەنگ و ئاشتی نەوەك چارەسەربێت.**

# سوراقی چی یە..؟

بلۆگەر : جەودەت احمد

بابەت : ئاژاوەی سیاسی

بەروار : 28ی جوون 2024

نیگارکێشی دەستی لە شێوەی نەخشاندنی ملوانکە جۆرێکە بۆ مانەوەی و داخزانی خەلکی سووریا بۆناوەخۆی عێراق ئەم پرۆژەیەی بە دیجیتال کرد بەناوی لابردنی سنوری عێراق و سوریا بۆ بازنەی هاوبەشی پێگەی نەتەوەی کە ناویان نا سوراقی، واتە لێکدانی دوو دەولەت لەسەر پێگەی مانەوەی هاوسۆزی و هاوسنووری و هاوزمانی و هاومەزهەبی نەخشەی عێراق و سووریا لێکدرا.

تائێرە روونە و ئاشکرایە، زۆرشت هەیە بۆ باسکردن بەلام ناکرێت بنووسین بەهۆکاری چاودێری هەوالگری دیجیتالی لێپێچینەوەی مەرگ لەگەل بلگۆر و شرۆڤەکاران دەکرێت بەناوی تێکدەری ئاسایش و بەرژەوەندی زلهێزی و ئقلیمی دەخرێتە لیستی داواکراوەکان. من لێرە باسی دیوێکی تری ئەم جەنگە دەکەم لە رووی هاوسنووری و جوگرافیای سیاسی لەگەل بەشی کوردستانی باشوور. بۆ جێگرکردنی جەنگ و ئاژاوەی سیاسی، سەرەتا سنووری ئەم ناوچەیە لە کۆبوونەوەی نهێنی هەوالگری بالا و سیاسی و سەربازی لە ئاستی زلهێزی بۆ زالبوون بەسەر ئقلیمی خالێکی جەنگ دیاری دەکرێت لە نێوان جیهانی ئاینی و ئایدۆلۆژی و ئابووری و جیۆسیاسی و سەربازی بەسەر عێراق و سوریا زالکرا بۆئەوەی بەهاوکاری ولاتانی دراوسێ ئەم پرۆژەیە بەردەوامی هەبێت بە پشتگیری میدیا دۆخی جەنگ دەگوازرێتەوە بۆ کۆچ و تێکدان و هێرش و خاکێکی خۆلەمێشی لەنێوان دوو جەمسەر بەهاوکاری گروپ و هزر و رۆحی مرتەزەقەی جەنگێکی چەقبەستووی سەرهەلدەدات.

کۆچی بەکۆمەل و پەرینەوە بۆ سنووری عێراق و هەرێم بەهاوکاری رێکخراوی جیهانی لە ئامادەباشی و گەیشتن بە راپۆرتی هەوالگریەکان جۆرێکە لە دامەزراوەی و فشاری دەستوەردان لەناوەخۆی هەولێر و بەغدا، خێزانی سووری لە چوارچێوەی سوراقی، عێراق گۆرا بۆگۆرەپانی جەنگی زلهێزی بۆسەر عێراقێکی لەرزۆك نوێکرایەوە، لێرە هیچ لەدۆخی سیاسەتی دیمەشق نەگۆرا چونکە خەلك کۆچی کرد و دەسەلات لەشوێنی خۆی مایەوە، کۆچی خەلك بۆ جێگریکردنی ئەم ئاژاوە سیاسی و سەربازی و جەنگی بوو تاکو وێنەیەك نمایشی جیهانبدرێت کە سوریا لەرووی مرۆی پێویستی بەهاوکاری و دلسۆزی سیاسی هەیە، بۆیە ولاتانی کەنداو بە پلەی یەك تێکدەر و هێشتنەوەی عێراقن لە ئاژاوەی سیاسی و مەزهەبی و نەتەوەی، ئەمە بۆئەوەی بەردەوام عێراق لەرووی مێژووی شارستانی لەرووخانبێت وە هێزی شارستانی لەناوەخۆی نەمێنێت ببێت بە خالی ئاژاوەی جیهان، وە دوورخستنەوەی تەوژمی جوگرافیای جەنگی پرۆکسی بە لاوازی بەردەوامی پێبدرێت واتە رووخانی عێراق و هەرێم لەکێشەی ئقلیمی و ناوەخۆی بخولێتەوە هیچ گۆرانکاری ریشەی بەسەر ئەم هێزە دەرەکیانە زالنەبێت.

بۆوێنە کۆچی بەلێشاوی سوربا بۆ ئەورووپا جۆرێك بوو لەبردنی جەستە و زێری سپی واتە نوێکردنەوەی کەرتی پیشەسازی لە ناوەخۆی ئەورووپا لەسەر کۆچبەران وەبەرهێنانی زیاتر دەکرێت و گەشەی ئابووری بەرزدەبێتەوە و تێچووی ئابووری مرۆی لە پێگەیاندنی منال بۆ هێزی مانەوەی قەوارەی دەولەت کەمترین تێچووی هەیە لێرە بازاری رەش لە سێکس و فرۆشتنی جەستە و پرکردنەوەی ئابووری مرۆی و نوێبوونەوەی بە ئەورووپا گەیاند کە پێویستی بە بردنی مرۆڤ نیە بەرێگای کۆن لە پرۆسەی کۆیلە کردن و گواستنەوە. جیهانی سەدەی 21 جۆرێکی نوێ بەخۆی وەبینی کە جەنگ وبرسیەت و ناسەقامگیری سیاسی و هێشتنەوەی سیستەمی رژێمی و لاوازکردنی دیموکراسی باشترین رێگایە بۆبردنی خەلك کە بە پارە و مالی خۆی رێگای کۆچ دەگرێتە بەر بۆحەسانەوە و داهاتووی خێزانەکە لە (خاك و نان و ئاشتی) جێگیر بکرێت.

کۆچ واتە نەمانی باوەری بەدەسەلات و بەتالبوونەوەی دەنگ و بچووك بوونەوەی قەبارەی دانیشتوان و پەرتەوازبوونی یەك دەنگی و لەناوچوونی کلتور و مێژووی و میراتی ئەم ولاتەیە بەهۆکاری کۆچی برسیەتی و ئاشتی و دۆزینەوەی خاك، کۆی

کۆچبەران بیر لەمانەوەی خۆشگوزەرانی دەکات، بەلام دیوی شاراوەی بردنی زێری سپی و هێزی جەستەی ئەم تاکانەیە کە لەسەر گیرفانی خۆی کۆچ دەکات، لە کۆی جیهان ئەگەر سالانە 1 ملیۆن کۆچ بکەن لێرە لە 20% دەبێتە قوربانی بازاری رەش لە بردنی جەستە و بەکۆیلەکردنی سێکس و وە دیوی 80% کەمتر پیشاندانی ناسیۆنالیزمی پروپاگەندەی ولاتانی کاپیتالیستیە بۆ ئەوەی خۆرێك لە بەرزکردنەوەی فشاری نەخۆشی دەروونی بەدژی ناوەخۆ و خواستی پشتگری کۆچی دەرەوە ئاراستە بکات.

نمایشی کاپیتالیستی لە براندی هێزی سیاسی و سەربازی، خۆشگوزەرانی بەکۆمەل و بەرزکردنەوەی ئابووری مرۆی لە هاوشانی جیهانی ژێری خۆرێبەری و رۆبۆت و چاخی دیجیتالی جۆرێکە لە پیشاندنی بەهەشتی زلێهزان لەچوارچێوەی (نان و خاك و ئاشتی) بۆیە تا ئاستی نەخوێندەواری و نزمبێت ئەوەندە گەوجی سیاسی و رژێمی میراتی لەسێبەری زلهێزان بەسەر ناوەخۆ زال دەکرێت. سلۆگانی کۆچ دەبێتە هۆی داروخانی دەروونی دەسەلاتی سیاسی ئەم ولاتە لەرووی ناوەراست و دەرەکی، بەلام هۆکاری راگری ئەم دەسەلاتە بەهۆی دژە جەمسەر و پێگەی مەزهەبی و نەتەوەی رێگری لە کەوتن دەکات وەك بنەمالەی ئەسەد کە جیهانی کۆمەنیستی نوێ خالی هێشتنەوەی دژە جمسەری ناتۆیە.

هەرێمی کوردستان بەهۆی دەرفەتەی نەتەوەی توانی سوپا و دەنگ و خێزان و کۆمەلگایەکی لێکدراوی لەناوەخۆی باشوور دابمەزرێنت بۆ جێگیرکردنی دەسەلاتی دووەم لەناوەخۆی باشوور کە بەخوێندنەوەی من هێزی سیاسی باشوور متمانەی بە خەلك نماوە بۆیە لە پرۆسەی دەنگدان وەك دەنگی یەدەگ کورسی پەرلەمان و هێزی درێژکردنەوەی حیزب لە هاوسۆزی سیاسەتی مرۆی و رێکخراوی جیهانی درێژدەکاتەوە. دووبارەی دەیخاتە ناو پرۆژەی ئابووری گەشتیاری رابواردن بەناوی مافی دەستی کرێکاری هەرزان وە لەناوبردنی دەستی کرێکاری ناوەخۆ بۆ ملکەچ بوون بە حیزب و حکومەت و کۆمپانیای خێزانی. بە ئاسانی خەلك لە بەیانی تا ئێوارە بە 10 هەزار کاردەکات داهات و خۆشگوزەرانی بەدەست ناهێنێت. لێرە خەلکی کوردستان کۆچ دەکەن بۆ دەرەوەی عێراق وە چینی عەوام و رەشۆکی لە خوێندەوار و نەخوێندەوار رام دەکرێن بۆ پیشەی چەکداری. لێرە کۆچ دەبێتە دیوی جەنگ جێگردەکات وە دیوی هێشتنەوەی حیزب لە کورسی درێژ دەکاتەوە.

لەدرەوەی شاری هەولێر و ناوەخۆ زۆربەی کارگە و کۆمپانیاکان لەلایەن خاوەنەکانیانەوە بە حەزی خۆی پرۆسەی رابواردن بەرێوەدبات لەگەل ئەم کرێکارە سوریانە کە لە رەگەزی نێر و مێ لەدوای کارکردن ئەم پرۆسانە بەرێوەدەچێت بەگوێر پرسیار و بەدواداچوون بەشێوەی هەرەمەکی بەتایبەت کەسانی شوفێری تاکسی ئاگاهی تەواوی ئەم رووداوانەیان هەیە بەهۆکاری گواستنەوە و گفتوگۆی رێگا، جۆرێك لە دۆزینەوەی سەرەداوی شاراوە لەناوەخۆی کۆچ بەران ئاشکرا دەکرێت وەك بێزاری و ناچاری باس لە دۆخی ژیانی خۆیان دەکەن. ئەمە بەلایەك، لەمە کارەساتتر ئەوەی خێزانی سووری دەبێتە قوربانی هەوالگری ناوخۆ و جیهانی بەهۆی پرکردنەوەی برسیەتی بەناچاری پەنا بۆگرێبەستی شاراوە دەبات لە جۆری تاوانی سپی و رەش و سوور کە لەدوای ئەنجامدان تاوانەکە دەکات، ئەم کەسانە کۆچی زۆرەملی دەکرێت بۆ شاردنەوەی تاوانەکە. لێرە کاریگەری دەرونی بەسەر ناوەخۆی باشوور زالدەبێت دەبێتە هۆی بێ متمانەی خەلك بە کۆچەبەر و حیزب و حکومەت. لەمە ترسناکتر رقلێبوونەوەی خەلك لە هێزی هاوپەیمان بەهۆکاری تێکدانی سەقامگیری هەرێم و عێراق و لە چوارچێوەی هێشتنەوەی هێزی سیاسی لاواز لە پێگەی دەسەلاتدا.

عێراق و هەرێم دەبێت پرۆژەی رێگری و دیپۆرتکردنەوەی ئاوەرەکانی سووریا درێژبکرێتەوە تاکو سیاسەتی ئەقلیمی و جیهانی بۆ ئاژاوە و ناسەقامگیری ناوەخۆی عێراق و هەرێم نەچێتە بواری جێبەجێکردن کە پاراستنی ئاسایشی خۆیان لەسەر ئاژاوەی عێراق و هەرێم جێگیر بکەن، دەبێت بەهەر شێوەیەك بێت کۆتای بە مانەوەی خەلکی سوریا بهێنرێت لەناوەخۆی عێراقی فیدرالدا. بەتایبەت داخستنی بنکەی رێکخراوی ئەقلیمی بۆ وەرگرتنی مۆلەتی مانەوە. بە راستگۆیانە قسە بکەین، کەنداوی عەرەبی هیچ پەیویست بە ناوەخۆی هەرێمی نیە تاکو خۆی بپارێزێت لە جەنگی پرۆکسی و ئاژاوەی پەنابەری، لەبەرئەوەی ئەوان گرێبەستی خۆشگوزەرانی و پاراستنی مانەوەی خۆیان لە دەسەلات و هێشتنەوەی سەروەری ولاتەکەیان لە ئەستۆی ئەمەریکا و ناتۆیە. بۆیە ئاژاوە گێری کەنداوی عەرەبی لەناوەخۆی عێراق و کوردستان تەنها بۆ دووبەرەکی ناسەقامگیری بەیەکنەگەیشتنی هەولێر و

بەغدایە لەرووی هێشتنەوەی ئاوارە و کرینی بەرهەمی ناوەخۆی کوردستان و پشتگیری دلسۆزی هەرێمی باشوور بۆ پەرتەوازی و ناسەقامگیری ناوەخۆی گەڵ عێراق دوور خستۆتەوە. واتە دەبێتە دژە ئاراستەی سیاسی بەرامبەر بە ئێران و تورکیا و جمسەری ئابووری جیهانی لەم ناوچەیەدا.

دەبێت عێراق و هەرێم گوێ بە پروپاگەندەی مافی مرۆڤ و رێکخراوی جیهانی نەدرێت بۆ هێشتنەوە هەناردەکردنی خەڵکی سوریا لە ناو ئاژاوەی عێراق دووبارە بتوێتەوە وێنەیەی گەورە لە چوارچێوەی نەخۆشی و نەخوێندەورای و هەژاری و بێکاری لەناو کەمپەکان پیشانی جیهان بدرێت بلێن عێراق و هەرێم پابەندی مافی ئاوارەکانین. ئەمرۆکە بەفەرمی [هیومەن](#) **رایت ووچ** لە مالپەری خۆی ئیدانەی عێراق و هەرێم دەکات بەناوی مافی و پروپاگەندەی، تا ئێستا سیاسەتی هەولێر و بەغدا بە ناهۆشیاری کەوتونە ناو ئەم چالە لێدراوەی جەنگی سوریا کە کار لەسەر سۆز و نەتەوەی و مەزهەبی دەکەن بۆ ڕاگواستنی خەڵك لەناسەقامگیری عێراق و هەرێم. بۆچی ولاتانی کەنداو ئەم پرۆژەیە لە ئەستۆناگرن لەسەر خاکی خۆیان؟ بۆچی ولاتانی زلهێز هەمان کار ئەنجام نادان لە راگرتنی ئاژاوەی سیاسی و جەنگ لەناوەخۆی سوریا؟ دەبێت هەولێر و بەغدا بریاری کۆتای بە کۆچی سووریا بهێنت تاکو دۆخی سیاسی و ئاسایشی جێگیربکرێت و هەولێر و بەغدا سەقامگیری ناوەخۆ بەرەوپێشتر بەرێت لە سێکتەری دامەزاروەی گشتی حکومەت و خەڵك و حیزب.

دەبێت خەڵکی عێراق و کوردستان هۆشیاربن لە مامەڵکردن دەکردن و دوورخستنەوەی کۆچی سووریا لە پێگەی کار و پەیوەندی کۆمەلایەتی و کۆچی پێچەوانە لەناوخۆ بۆ سوریا و دەرەوەی عێراق و هەرێم. ئەمە بەلایەنی رەگەزپەرستی بیرناکەمەوە بەلکو بەهێشتنەوەی عێراق و هەرێم لە سەروەری و دوور خستنەوە لە ئاژاوەی سیاسی و جەنگ و مرۆی، بەلای من گرنگترە نەوەك تێکەوتن لە نەفامی سیاسی بەناوی مافی مرۆڤ و دلسۆزی سیاسی. هێشتنەوەی هەرێم و عێراق دەبێت لەسەر سیاسەتێکی لۆژك و رەق بەرێوەبچێت بۆ مانەوەی چارەنووسی خەڵك و حکومەت.

# کودەتای هەڵبژاردن لە هەرێمی باشوور

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : ئاژاوەی سیاسی
بەروار : 29ی جوون 2024

نوێبوونەوەی حکومەت و دامەزراوەی گشتی و ئاراستەی سیاسی حیزب و مایکرۆجەماوەری لە چوارچێوەی دەسەلاتی یەك حیزبی تاکرەوی و دوو حیزبی کە زۆرینەی کورسی پەرلەمان بەردەکەوێت هێزی سیاسی دووەم دەبێتە چاودێر بەسەر ئەدای دامەزراوەی گشتی حکومەت و جوولەی ئاراستەی سیاسی حیزب لێرە حیزبی دووەم دەبێتە ئۆپۆزسیۆن کە بەردەوام چەقی گرفت و هەڵەو دواکەوتنی حکومەت و پەرلەمان دەخاتە بەرشرۆڤەی میدیای و بوژانەوەی رێکخستنی ناوەخۆی حیزب. بۆیە هەنگاوی ئۆپۆزسیۆنی بوێرانە هاوشانی حیزبی یەکەم لە دەسەلات کاری بەرێوەبردنی کرداری دلسۆزی و لۆژیکی بەرێوەدەبات بەرێگای دژ و بەرژەوەندی جەماوەری.

لە هەرێمی باشوور چەمکی ئۆپۆزسیۆن تەنها کار لەسەر قیژەی کۆمەڵگا دەکات بێگەرانەوە بۆ دامەزراندن وبەدواداچوونی کەرتی شارەوانی و سیاسی و مرۆی و سەربازی و ئابووری، خالی گرینگی ئۆپۆزسیۆن بریتیە لە گەوجاندنی خەلك بەرێگای زیرەکی دەروونی و بەردەوامیدانی پرۆسەی (کرداری دەروونی). لێرە خەباتی ئۆپۆزسیۆن بەلاوازی رێچکە دەگرێت بەهۆکاری پەرتەوازەی هێزی سەربازی لە دەست خێزان و حیزب و ناوچەگەریدا، داتەپینی ئابووری کۆمپرادۆری هاوردە و سیاسەتێکی هیپۆکراسی و نەتەوەپەرستی جۆرێکە لە رێگری ریفۆرمی ناوەخۆی هەرێم و لاوازکردنی ئۆپۆزسیۆنی راستەقینە.

هەرچی دەسەلاتی فرە حیزب و مایکرۆ جەماوەرییە کار لەسەر رۆتیناتی رۆژ دەکات بەناوی خۆبەخشی و زانیاری بەخشین لە پرۆژەی خوێندن دوور لە زانست و پرکردنەوەی هەلی کاری ئابووری لاواز و پیشاندانی قیژەی کۆمەلگا بەناوی چاکسازی کە خۆیان باوەڕیان بەرۆحیەتی چاکبوون نیە، بۆیە بە درێژای کات دێتە ریزی حیزبی یەك دەسەلات و جێگرەوەی حکومەتی دوو دەسەلات، واتە لەسەرهەمان ریتمی کۆن بەعقلی جیهانگیری نوێ هەنگاو دەهاوێت بەلام لە خالی سفر دەخولێتەوە هیچ کاریگەری نابێت. بۆیە کۆمەلگا وشیار دەکاتەوە بەناوی پرۆژەی رۆشنبیری گەمژەی کە بەشێکە لە پاشماوەی حیزبی کلاسیك. لێرە حیزبی کلاسیکی یەك دەسەلات و اصحابەی ئۆپۆزسیۆنی بە گرێبەستێك ئاراستەی ئۆپۆزسیۆن و مایکرۆ جەماوەری جوولەی جەماوەری و حیزبی و میدیای و دامەزراوەی گشتی حکومەتی دەگۆرێت و دەیخاتە سەر ریتمی خۆی.

لە ئەرشیفی کەی ئێن ئێن ماوە لە نێوان سالانی 2008 تا 2012 خەلکی دارەتوو داوای خۆشگوزەرانیان دەکرد لە وەرزی سال بەهۆی دواکەوتنی ژیان خەلك وەك نەیار شەیدا، هەرەشەی دەنگدانی دەکرد ئەوکات (نەوزاد هادی) پارێزگاری هەولێربوو بەم چەشنە ولامی خەلکی دابۆوە (پارتی پێویستی بەم جۆرە دەنگانە نیە). واتە بێ نرخی و بەهای خەلك و خۆشگوزەرانی بەلای پارێزگار تەنها بریقەدارکردنی شاری هەولێر بوو لەرووی بالەخان و شەقام بە پارەی قەرزی بانکی جیهانی سەر بەناتۆ. سەرباری دابرینی هەرێم بۆ دوو ئاستی لاواز و لەرزۆك.

بۆ وێنە ئەندامی حیزبی فەرمی و بێ لایەن، لەناوەخۆی حیزبی کلاسیك بە جەماوەری رەشۆکی وەسف دەکرێت و هیچ پلە و کرداری نابەخشێت بەم جۆرە ئەندامانە تەنها لەکاتی کەوتنی رێکخستنی حیزب پەنای بۆ دەبات بۆ ریفۆرمکردنی ناوەخۆی دەسەلاتی هەیکەلی حیزب لە سێبەری خێزانی حیزبدا. ئەم ئەندامانە بریتیە لە (هەلگەراوە - بێ لایەن - زویر - دژ). واتە (پارتیە بوویتە یەکێتی دواتر گەرایتەوە ناو حیزب، بێ لایەن وەك هاولاتی یان دژە پارتیە بەلام بەلاوازی ماوەتەوە یان تورەبووە بەهۆی بێ مووچەی و خۆشی ژیان بەلام لە پێگەی حیزب بە ئەندامی بێ لایەنە واتە ناچێتە ژێر پرێنسیپی حیزب).

هەرچی ئەندامی فەرمی حیزب کە لەژێر پرێنسیپی حیزبدایە، ئەمانە وەك سوپای جەماوەری لە کەرتی حکومەت و تایبەت و سەربەخۆ بۆ دوو بازار کاردەکەن کە بەرێوەبردنی ئەجێندای حیزب لە ناوەخۆی دامەزراوەی حکومەت بە ئاراستەی سیاسی خێزانی حیزب بەرێوەدەچێت، هەرچی کەرتی تایبەت جۆرێکە لە سوپای ئابووری و دەماری دۆزینەوەی دۆلارە بۆ بوژانەوەی حیزب بەناوی نیولیبرالی و کەرتی گشتی کێشمیە و کەرتی تایبەت چارسەرە. لێرە ئەم نوێنەرایەتی لە شۆردنەوەی دۆلار و زێر و داهاتی حیزب بەرێوەدەچێت لەناوەخۆ و ئاراستەکردنی بۆ دەرەوەی جیهان.

قۆناغی ئەندامی سەربەخۆ جۆرێکە لە پروپاگەندی رۆژانە لە رێگای دیجیتالی و گەشت و خوێندن و بازرگانی و گۆرینەوەی دبلۆماسی پرۆژەی کارنامەی حیزب بەرێوەدەبات لەسەر داهاتی گشتی بۆ نوێنەرایەتی حیزب و خێزان، کۆتا پەیام دەگەیەنێتە جیهان لێرە ئەم سێ ستوونە جۆرێکە لە راگرتنی حیزب لە ناوەخۆی کوردستان و بەشداری پێکردنە لە پرۆسەی دەنگدانە.

ستونی ئەندامی سەربازی ستونی راگرتنی پاراستنی خێزانی حیزب و کۆمپانیا و جەماوەرە بەناوی خەباتی نیشتیمان و گەوجاندنی تاك لە چوارچێوەی کۆنەپەرستی لە پرۆژەی نەتەوایەتی دووبارە خوێنی ئەمانە دەکولێنن دەیخەنە ناو پرۆسەی دەنگدان تاکو دەنگی زۆرینە بۆ مانەوەی حکومەتی یەك حیزبی درێژە بەتەمەنی مانەوەی بدات لێرە راستەوخۆ لۆبی بۆ خاك و ئاشتی و نان لە چوارچێوەی خێزانی حیزب نوێدەبێتەوە بەلام جیهانی زلهێزان هۆشیارانە مامەلە لەگەل ئەم جۆرە سوپا و دەنگ و هەلبژاردنانە دەکەن بۆیە بە پەروەردەی دوو سەر لە سێبەری خۆیان بەرێوەدەبن بەناوی هاوکاری و راهێنان و پشتگری و مانەوە. کەواتە دەنگی حیزبە بەلام رۆحیەتی سوپا

لە دەست زلهێزانە بە ڕێنمایەك لەكەمترین كات كودەتا بەسەر حیزب و حكومەت و هەلبژاردن دەكات ئەگەر دۆخی بەرژەوەندی و ئقلیمی و زلهێزی بەرەو لەناوچون چوو.

لە سیستەمی دوو حیزبی كار لەسەر شارەوانی و بنیادنانی هەرێم ناكرێت بەلكو بەرێگای هاوردە بۆشای وەبەرهێنانی ناوەخۆی پردەكاتەوە لە ئابووری مرۆی و پێداویستی و كەرتی گشتی حكومەت. زۆرجار پرۆسەی هەناردەكردنی خەلك بۆدەرەوە بەرێوەدەچێت بەلام هیچ سوودی بۆناوەخۆ نابێت چونكە هەرێمی باشوور لە ئابووری مرۆی داتەپێوە بەم یاسایە (دوور دەخرێت + دوادەكەوێت + هەلسانەوەی لە سەرخۆ ). ئەمە بۆ ماوەی 30 سال پێشناكەوێت سەرباری تێچووی 20 ملیار دۆلار لە راهێنانی زانستی و جەستەی و دەروونی. بۆیە قۆناغی شارەوانی دەبێتە پرۆژەی كرچووكال واتە بەرێگای مەودای پەرتەوازە پرۆژەكان بەرێوەدەچێت لەكۆتای وێنەیەكی گەورە بە خەلكی كوردستان پیشان دەدەن كە چ كراوە بۆ هەرێم بەلام لەرزۆك و رووخێنەرە تەنها وەك (سناپی سیاسی) نمایش دەكرێت بۆیە كەوتنی حیزب لە هەلبژاردن و خۆریفۆرمكردنەوە لە رێكخستنی حیزب و دروستكردنی ئاژاوەی سەربازی بۆناوەخۆی كوردستان تەنها ئامانج لە رێگری كردنی كودەتای هەلبژاردنە لەناوەخۆی جەماوەری و هاتنی هێزی نوێ بۆ مەیدانی سیاسەت. دەسەلاتی سیاسی كلاسیك لە پرۆژەی هەلبژاردن یاری لە سەر (دەزوی باریك وەك موو) هەولی مانەوە و درێژكردنەوەی خەباتی پراگماتی لە جەستەی پراگماتیستی گشتاندنی عەوام ئەنجامدەدات و وێنەیەكی وەهمی و وەص وەصەی بە خەلك دەفرۆشێتەوە دەلێت (45 كورسی دەهێنین) بەم جۆرە سیاسەتە دەلێت (ترِی حیزبی) واتە لە ترسی كەوتن و ژانەزگی هەلەی سیاسی جۆرە ترێكی گەورە دەكات دەلێت من ماوم نەكەوتم بۆیە براوەم؟ ئەگەر بگەرێتەوە بۆ مێژوو و كۆنگر و بەرێوەبردنی حكومەت، دەزانی ئاستی لاوازی سیاسی و حیزبی و دامەزراوەی حكومەت لە چ ئاستێكە بەلام بەهۆكاری رۆتیناتی كرداری دبلۆماسی خۆهەلواسین نمایشی پێگە و تەقلیدی حیزب بەرێوەدەبن لە میدیای ناوەخۆی هیچ ناوەرۆكی سیاسی تێدانی یە. ئەزانن چۆنە؟ لە حكومەتی یەك حیزبی و دوو حیزبی تقلید هیچ كەسێك سەروەری نیە هەمویان وەك مەڕ و شوان سەیردەكرێن. تۆ خاوەنی دكتۆرای بیت هیچ جیاوازیت نیە لەگەل نەخوێندەوارێك. لێرە دكتۆراكە رێكخستنی حیزب و حكومەت و بازرگانی بۆدەكات وە نەخوێندەوارەكە زمانی قامچی یە بۆ راگرتنی حیزب لە هاوشانی سوپایەكی مەدەنی لەناوەخۆی هەرێمدا.

حیزبی كلاسیك كار لەسەر خۆشگوزەرانی و شارەوانی و ئاسایشی نیشتیمانی ناكات بەلكو بەرێگای مووچەی سەرباز و حیزبی و كەرتی تایبەت و سەربەخۆی لە سێبەری ئەم حیزب و حكومەتە بەرێوەدەچیت و ژیان دەگوزەرێنی بۆیە ئەم (سەبجێكت)انە واتە تاكەكان ناتوانن داوای شارەوانی و خۆشگوزەرانی بكەن بەلكو لە جەستەی خۆی دەتوێتەوە یان كۆچ دەكات بۆ دەرەوە یان دژی دەوستێتەوە دەچێتە ریز قیژەی ئۆپۆزسیۆنی دوو حیزبی و مایكرۆ جەماوەری. بۆیە دەنگدان دەبێتە مۆتەكە بۆ حیزبی میراتی و كلاسیك و حكومەتی یەك حیزبی و دوو حیزبی. بەناچاری پشت بە هێزی ئقلیمی دەبەستێت و مەودای حكومەت درێژدەكاتەوە جەنگی دەروونی دەخاتە ناوەخۆی شەقامی كوردی و جەنگی پارچەكانی تری كوردستان لەناوەخۆ هەرێمی باشوور بەگەردەخات تاكو هیچ ئەگەرێكی كودەتای و دۆراندنی پەرلەمان و حكومەت و حیزب روونەدات بەلكو درێژەی پێدەدات بۆمانەوەی خۆی.

## دوو جۆری دەنگدان هەیە...

## ده‌نگدانی دلسۆزی...

ئه‌م جۆره‌ پرۆسه‌یه‌ به‌رێگای دلسۆزی و شه‌رمی ده‌روونی و كلتوری ده‌نگ به‌ حیزب و لایه‌نگری دۆست و ناسیاو ده‌دات، به‌لام رۆلی ئه‌م حیزب هیچ نرخ و به‌های به‌ خه‌لك و جه‌ماوه‌ره‌كه‌ی نادات به‌لكو گرنگی گه‌وجاندنی خه‌لك به‌رێگای دیوه‌خان و كۆمپانیا و مزگه‌وت و كه‌نیسه‌ و چینی رۆشنفكرانی گه‌مژه‌ سه‌رجه‌م ده‌نگ و پلانی سه‌ركه‌وتنی هه‌لبژاردن به‌گر ده‌خات بۆبردنه‌وه‌ی پێگه‌ی خۆی ئه‌گه‌ر له‌یادتانبێت له‌ هه‌لبژاردنی رابردوو پێگه‌ی كه‌سایه‌تی (كاك نێچیرڤان ئیدریس) به‌كارهات بۆ راكێشانی دلسۆزی لایه‌نگری كه‌سی به‌سه‌ر كۆكردنه‌وه‌ی ده‌نگ بۆ حیزب له‌ سلۆگانی (پرۆژه‌ی نه‌وت بۆ هه‌مووانه‌). خه‌لكی (ره‌شۆكی و رۆشنفكرانی گه‌مژه‌) پشتگیری پرۆژه‌كه‌یانكردو به‌هه‌رشێویه‌ك بێت درێژه‌یان به‌ خه‌باتی پراگماتی خۆیاندا.

ده‌نگدانی دلسۆزی له‌ پرۆسه‌ی سیاسی و دامه‌زراوه‌ی حیزب و حكومه‌ت به‌ ناشه‌رعی وه‌سف ده‌كرێت به‌ئه‌گه‌ری ناهۆشیاری خه‌لك و نه‌خوێنده‌واری و نه‌خۆشی و هه‌ژاری و بێكاری و دواكه‌وتی كۆمه‌لگا پێناسه‌ی بۆده‌كرێت بۆیه‌ پرۆسه‌ی ده‌نگدانی دلسۆزی كار ده‌كات له‌سه‌ر یاسای بریاردانی له‌ناكاو بێ بیركردنه‌وه‌ له‌ گۆشه‌ی (سۆز - شه‌ر - شاد) واته‌ هیچ لۆژیكێكی ئاسمانی و زه‌وی به‌ نالۆژك وه‌سف ده‌كات ئه‌گه‌ر مرۆڤ له‌سه‌ر ئه‌م یاسایه‌ بریار بدات بۆ گۆرینی ده‌سه‌لاتی سیاسی و دامه‌زراوه‌ی حكومی. ئاگاداربن ده‌نگدان له‌م سۆنگه‌یه‌وه‌ په‌یره‌وی مه‌كه‌ن.

## ده‌نگدانی زیره‌كی ژیری..

ئه‌م جۆره‌ ده‌نگدانه‌ كاریگه‌ری له‌سه‌ر پێشهات و دواهاته‌كانی ناوه‌خۆی هه‌رێمی باشوور ده‌كات به‌هۆكاری ئه‌گه‌ر و پێشهاته‌كان و بیرده‌كاته‌وه‌، كامه‌ هێز ده‌توانێت ئاسایشی كوردستان بپارێزت و سوپا بخاته‌ رێزی نیشتیمان و حكومه‌ت به‌ مه‌ده‌نیه‌ت بكات و دادگا و یاسا و جێبه‌جێكردن و په‌رله‌مان نوێكاری بكات له‌ سیسته‌می گه‌شه‌پێدانی دیموكراسی به‌رده‌وامی، بۆیه‌ زیره‌كی ده‌روونی و هزری و عقلی و رۆحی و جه‌ستی باشترین پێگه‌ی هێزی حیزب و مایكرۆ جه‌ماوه‌ری له‌ ناوه‌خۆی هه‌رێمی باشوور دیاری ده‌كات چونكه‌ جۆری ده‌نگدان له‌سه‌ر راسته‌كردنه‌وه‌ی هه‌له‌و پێشخستنی كۆمه‌لگا په‌یره‌وه‌ی ده‌كات. حیزبی كلاسیك ترسی له‌ رووخانی ئه‌م جۆره‌ ده‌نگ و كوده‌تای هه‌لبژاردنه‌ له‌ناوه‌خۆی جه‌ماوه‌ر و ئه‌ندام و لایه‌نگران و ئاراسته‌ی ئایدۆلۆژی ده‌نگی نوێ و كاندنی پێشكه‌وت.

له‌م ده‌نگدانه‌ به‌وریای ده‌نگبدرێت و كاریگه‌ری دلسۆزی و ره‌فتاری نه‌بێته‌هۆكاری كه‌وتنی هه‌رێم بۆ 4 سالی داهاتوو، ده‌بێت لۆژیكانه‌ بریار بدرێت له‌سه‌ر هه‌لبژارند و دۆزینه‌وه‌ی كادیری پێشكه‌وت و له‌به‌ره‌ی خه‌لك و په‌له‌مان و حكومه‌تدا جێگای تێرامانی گۆرینی ناوه‌خۆی هه‌رێمی باشووره‌ له‌ چاوی زلهێزان و پیشتگری نوێبوونه‌وه‌ی حكومه‌ت و په‌رله‌مان و جه‌ماوه‌ر.

**ت: وێنه‌ی پارتی دیموكراسی كوردستان له‌ شرۆڤه‌ی بۆچووندا.**

# هه‌رێمی باشوور (به‌تاله‌)

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : تیۆری سیاسی
بەروار : 30ی جوون 2024

بەگوێرەی یاسای زانای سیاسی دێڤد ئیستۆن و لێكدانەوەم بۆ یاساكە، سیستەمی سیاسی و حكومەت و پەرلەمانی كوردستانی باشوور (بەتاڵە) چونكە دامەزراوەی سێكتەری گشتی حكومەت لەگەڵ جوولەی خەڵك و خالی دامەزراوەی كارگێری و سیاسی دەبێتە بازنەی ئارامی (فیدباك) لێرە گەرانەوە بۆ مێژووی و كابینەكان و سیاسەتی حیزب، سەرباری هەڵبژاردنی ناشەرعی، هەرێمی كوردستان لە خالی بۆشای سیاسی و كارگێری بەتاڵ دەخولێتەوە.

دەنگدانی دلسۆزی واتە كەسێك دەنگ دەدات بەگوێری (سۆز و شەر و شادی) لەم سۆنگەیەوە هیچ بەهاو نرخی نامێنێت بۆ دامەزراوەی حكومەت و پەرلەمان چونكە ئاستی ناهۆشیاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و بێكاری و داتەپینی شارەوانی و پاشەكشەی خۆشگوزەرانی خەڵك بەشێكە بۆمانەوەی دەسەلاتی یەك حیزبی و دووحیزبی و مایكرۆ جەماوەری سەرجەمیان كار لەسەر یاسای دەنگدانی دلسۆزی دەكەن. ئەگەر ئاستی دەنگدانی دلسۆزی 60% ئەوە ئاستی دەنگدانی ستراتیژی كەمتر لە 20% چونكە دەنگدانی ستراتیژی واتە چینی ناوەراست لە كەسانی رۆشنفكر و كۆمەڵگای خوێندەوار و خوێنەر و خوێندنەوە بۆ كۆمەڵگایەكان، ئەوكات ئەوانە بریار لەسەر مانەوە و گۆرینی دەسەلات دەكەن.

كەواتە **ستووی كلتور** لە لقی سێیەم كە رۆحیەتی رۆشنبیرییە تەواوكەری ستوونی دووەمە كە جوولە بە گەشە و مانەوە و گۆرانكاری سێكتەری گشتی كلتوری ئەم هەرێمە دەبەخشێت لەسەر بنەمای دامەزراوەی ستوونی یەكەم لە (مرۆڤ و دەوروبەر) واتە ستوونی كلتور لە (مرۆڤ و مادە) لەگەڵ ستوونی دووەم كە دامەزراوەی گشتی تەواوكەری رۆحیەتی رۆشنفكرانە بۆ تەواوكردنی دامەزراوەی پەرلەمان و حكومەت و حیزب و جەماوەر لە قەوارەی هەرێمی ئۆتۆنۆمی سەر بە ناوەندنی پێكهاتەی نەتەوەی فیدرالە.
واتە هەرێمی باشوور بەهۆی لاوازی ئاستی هۆشیاری و زانستی و زانیاری ناتوانێت دیموكراسی جێبەجێبكات و خۆی پشتراستبكاتەوە بلێت ستوونی رۆحیەتی رۆشنبیری لە گەشەبووندایە بەڵكو لە پاشەكشەیە.

شیكردنەوەی داتای سیاسی و كارگێری هەرێمی باشوور لە پێگەی جەماوەر و دامەزراوەی و ئاراستەی سیاسی بەرێژەی لەرووی زانستی حكومەتی هەرێم و حیزب و جەماوەر لە دەرەوەی زانستی سیاسییە چونكە ئاستی دەنگدان لەسەر (عەوام واتە رەشو رووت) پرۆسەی هەڵبژاردن بەرێوەدەچێت بۆیە سەرجەم كاریگەری ناوەخۆی خەڵك و مێژوو و رووداوەكان سەرچاوەی تەواوی بەتاڵ بوونەوەی هەرێمی كوردستان دەردەخات لە سیستەمی سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆی و دامەزراوەی گشتی هەرێم.

ئاراستەی دامەزراوەی حكومەت، لەسێبەری سیاسەتی حیزب بەرێوەدەچێت وەك كۆكراوەی مێرنشینی و ئەنجوومەنیە لەناوەخۆی حكومەتی هەرێم و سەرجەم كابینەكان، ئەوەندەی رۆلی حیزب بەسەر سەروەری حكومەت و هەرێم زاڵە، كەچی پێگەی هاولاتیبون لە ناوەخۆی هەرێم لە ئاستی خوارەوەی خالی كۆتای سیستەمەی پراگماتی خێزانی و حیزب و كۆمپانیایدایە واتە بەهاولاتیكردنی شەقامی باشوور بەرێگای سێبەری حیزب و كۆمپانیای هاوبەش و حكومەتی هەرێم لەشێوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی مێرنشی یە، ئاراستی دادگا و یاسا و جێبەجێكردن و شارەوانی و پەرلەمان لە دەسەلاتی كەمینە بەسەر زۆرینە زالە وەك نوێنەری و فێلی كۆنەپەرستی نەتەوەی لە هەرێمێكی پێكهاتەی كوردستانی باشوور دەخولێتەوە.

وەك یاساناس بوون دەرنابرم بەلام وەك تێگەیشت لە زانستی سیاسی هەرێمی باشوور لەرووی شەرعی دامەزراوە لە سێبەری عێراقی فیدرال و دەستوور بەرێوەدەچێت ئەم بەرێوەچوون بە مادەی 1483 بە داگیركراوی لە سێبەری واشنتۆن و ناتۆ بەرێوەدەچێت. ئەگەر بگەرێنەوە بۆ كابینەی 9 تەنها واشنتۆن و بەغدا، حكومەتی ماوەبەسەرچووی بە لاوازی راگیراوە تاكو نەبێتە بۆشای جەنگ و ئاژاوەی سیاسی بۆیە دەسەلاتێكی نەرم بەخشراوە بە هەرێم لێرە حیزبە كلاسیك و مایكرۆ جەماوەری لە ترسی كەوتن و لەدەستدانی دەنگ، درێژە بە هەڵبژاردن دەدەن تاكو دەگاتە ئاستی دلنیای لە دەرچوون لەسەر هەمان سیستەمی دەنگدانی نالۆژیك و بەتال لە یاسای (سۆز و دژ و شاد) بەرێوەدەچێت و دژ بە دەنگی (ستراتیژی چینی ناوەند) دووبارە حكومەت و پەرلەمان و دامەزراوەی گشتی لەسەر نەمەتی كۆن لە جەستەی نوێ دادەرێژێتەوە بەناوی (قەوارەی هەرێمی كلاسیكی كۆنەپەرستی نەتەوەی بۆ نیولیبرال دیموكراسی رژێمی و

حکومەتی دووحیزبی تاکرەوی) کەواتە شەرعەیەتی هەرێم لە 20% بۆ دامەزراوەی کابینەی رابردوو بۆ داهاتوو. نەوەك 60% بێت. ئەم بۆچوونە لەرووی سیاسی و ناوەرۆکی زانستی سیاسیدا رووی هەرێمی باشوور دەردەخات کە لە خالی بەتال دەخولێتەوە.

# دەرفەتی ئۆتۆنۆمی سیاسی لە هەولێر

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : هزری سیاسی
بەروار : 1 جولای 2024

بیرکردنەوەی نووسینەکانم بەگوێرەی هزری پەتی دەخەمە، زیاتر لە 1 مانگە لانەی کچم داوای سەیرکردنی یوتویوب دەکات بۆئەوەی کۆپیەکی هزری هونەری لە دیجیتالەوە دووبارە بنەخشێنی لەسەر پەری کاغەز تاکو لێهاتووی دیار بکات و شەرعیەتی باوەرهێنانی ئێمە لە مالەوە بەدەست بهێنێ بەلام بەدوور خستنەوە لە ژینگەی فەنتازی دیجیتالی و باوەربەخۆبوون و بیرکردنەوەی (پەتی) خۆی جۆرێك لە زیرەکی دەروونی و ژمارەی دەخاتە سەر پەری کاغەز، بۆیە خوێندنی زانست جۆرێکە لە ئاودانی هزری پەتی لە ژینگەی ناوەخۆی خێزانی کوردی.

بۆوێنە لە پەیمانگای پێشەنگ لەکاتی خوێندن لە سەرەتای سال تا ناوەراستی زۆر هەستم بە (نائۆتۆنۆمی خوێندن) دەکرد وەك زیندانی گشتی بوو بۆ ئێمە تەنها لەرێگای (تەلقینی زیندو) واتە خوێندنەوەی ئاراستەی مامۆستا بەسەر قوتابی زالوو، ئەم تاکرەویە هیچ گۆرانکاری ناکات لە ئۆتۆنۆمی خوێندن قوتابی، بۆیە دوور کەوتمەوە پەنام بۆ خۆرێبەری ئۆتۆنۆمی برد واتە (هرزی پەتی لە ژێری خۆرێبەریدا) بەهۆی بەرکەوتنی (ئۆبجێکت و سەبجێکت) لێرە گەشەی پالنەری دەوروبەر لەرووی (ڕیالیستی - راستی ژیار) جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی وەبەرهێنانی تاك بەرهەمدێت لە شەقامی کوردی لە چوارچێوەی ئاژاوەی سیاسی و کەوتنی سێکتەری گشتی حکومەت و داتەپینی ئابووری (کرێ و کۆمپرادۆری) جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی سیاسی و کادیری سەرەبەخۆ بەرهەمدێت کە دەتوانێت گۆشەی هەلەی ناوەخۆی و ئقلیمی و جیهانی لە رابردوو بۆ ئێستا و داهاتووی بەردەوام دەست نیشان بکات و لە جێگادانانی بۆدابنێت.

کەواتە ئۆتۆنۆمی سیاسی جۆرێکە لە هزری پەتی و کەسی و ناوچەی لە چوارچێوەی بەرکەوتنی رووداوی رۆژ و گەشەی تاك لە (پالنەری ئاژاوەی سیاسی و هەوالگری و حیزبی) جۆرێکە لە دەرخەری ئەنجامەکان بەدەست دێت کە لەدایکبوونی چینی حیزب یان مایکرۆ جەماوەری لەناخی ئەم شەقامە بەسەر ئاراستەی دەنگی (جووڕە و عەوام) و دەنگی (ستراتیژی نوخبەی تایبەت) دادەمەزرێت لێرە بردنی دەنگ و لەدایکبوونی ئۆتۆنۆمی لە بۆشای ئاژاوەی سیاسی و هەوالگری و دواکەوتنی دیموکراسی بەهۆی کەوتنی سێکتەری گشتی حکومەت و لاوازی پەرلەمان لە نوێنەرایەتی و ئەدای سەربەخۆی کارکردن دەبێتە (ئۆبجێکتی چەقەبەستووی و داروخانی خێرا) بۆیە وێنەی لە دایکبوونی ئۆتۆنۆمی سیاسی لە هزری پەتی هەموو جەمسەرەکان تێك دەشکێنێت بەرێگای خۆرێکخستنوە ئاستی دەنگی (جووڕە و ستراتیژی) دەبێتە پاکێچی گۆرینی سیاسەت و دامەزراوەی حکومی و هەلسانەوەی هەرێمی باشوور لەناو ئەم ئۆتۆنۆمیە سیاسییە شازە دەچێتە بواری کارکردن و گۆرانکاری لە وەبەرهێنانی گشتی دەبێتە نوێبوونەوە دۆخی سیاسی و دبلۆماسی و ئابووری و ئاسایشی نیشتیمانی باشوور ڕێگایەکی خێرایە بۆدەرفەتی وەبەرهێنان لە گۆرینی سیستەمی کۆمەلگای کۆنەپەرستی نەتەوەی بۆ پیشەسازی و چەرخی دیجیتالی.

شەقامی باشوور بەهۆی زۆرداری مێرنشینی و خێڵەکی و گۆرانکاری سیاسەتی ناوەخۆی عێراق زۆرترین زیانی ئابووری مرۆی بەرکەوتووە ئەم هەڵسانەوەی ئابووریە تێچووی 20 ملیار دۆلاری پێویستە بۆ 30 سالی داهاتوو واتە لە 30 سالی داهاتوو جیهانی پیشەسازی گەورەترین هەنگاو لەپێشە بەلام لەدایکبوونی ئۆتۆنۆمی سیاسی نوێ دەرفەتێکە لەگەل ئەم 30 سالە دۆخی ناوەخۆی هەرێم لە ئابووری کری دەگۆڕێت بۆ مێگا پرۆژەی پیشەسازی و داهێنان لە ماتریالەکان دەبێتە هۆکاری سەقامگیری ئاسایشی باشوور و گۆرینی ریشەی هێزی سیاسی لە حکومەت دوو حیزبی و دوو زۆنی بۆ هەرێمی باشوور لە پێگەی دامەزراوەیەکی ئۆتۆنۆمی سیاسی و فەریکە سیاسی کە ئاراستەی ئەم داتەپینەی هەرێم بۆ قۆناغی نزیك لە ریفۆرمی نەتەوەپەرستی بۆ داهێنانی و ئابووری مرۆی جێگیردەبێت.

بۆیە ئاژاوەی سیاسی و هەوالگری و تێوەگلانی سیناریۆی جۆراوجۆر جۆرێکە لە کردنەوەی دەرگای نوێ بۆ هێزی جەماوەری لە ئۆتۆنۆمی سیاسی هەرێمی باشوور دەگۆڕێت بۆ جێگیرکردنی دیموکراسی و رەنگدانەوەی لە رۆژهەلاتی ناوەراست و جیهاندا. ئەم ئۆتۆنۆمیە زۆرروونە بۆ ئێمەی گەنج کە لەپاشماوەی (دەنگی خاك) دوور لە حیزب و ئایدۆلۆژی بتوانێت باشوور رزگاربکات لە چەقبەستووی حیزبی و سیاسی و دامەزراوەی حکومی و لاوازی جەماوەریدا.

لە دکتۆر قاسملۆیان پرسی چۆن ئابووری رۆژهەلات دەبوژێنیەوە؟ ووتی ئەمە هەمووی دەشت و دەرە دەتوانین تەنها ترێ بەرهەمبهێنن و بیکەینە شەراب لەناوەخۆ و جیهان بفرۆشین. کەواتە گێرانەوەی دکتۆر رێك هەلقولاوی ئەم شەرابەیە کەلە خاکی کوردستان لەدایك دەبێت بەناوی ئۆتۆنۆمی سیاسی نوێ بۆ گشتاندنی ناوەخۆی باشوور و کوردستانی گەورە لە داهاتووی نادیاردا.

دەرفەتەکان روون و ئاژاوەکان دووبارەن و نوێبوونەوە لە رۆتیناتی رۆژانە هیچی تر نیە کەواتە لە دایکبوونی ئۆتۆنۆمی سیاسی نوێ رێگایەکی خێرایە بۆ گۆرینی باشوور لەم گێراوە دروستکراوە و دواکەوتووەی کۆمەلگایەدا.

# چۆن یاری سیاسی دەکرێت...؟

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : تیۆری سیاسی
بەروار : 2ی جولای 2024

یاری سیاسی بەدوو ستووی نادیاری ئەنجامدەدرێت بۆ ئەوەی رووداوەکان لە رووی راستی خۆیان نمایش بکەن تاکو میدیا و خەلك و رێکخراوی جیهانی دۆخی مەیدانی بگوازنەوە بۆ دۆخی فیزیکی و شێواندنی دەروونی بە رێگای لافاوی (ئەلخەواریزم) زۆرترین پێشهاتەکان بۆ بەکاربەرانی دیجیتالی دەربخات کامە چیرۆك و ناوەرۆك نزیکە لە خواستی دەروونی و کاریگەری دەردانی تورەی و شادی لەم گرتەڤیدیۆیانە، ئەوکات ناوەرۆکی دیجیتالی زال دەبێت بەسەر ناوچەکە. ئاستی قازانجی کۆمپانیا ریکلام بەرزدەبێتەوە وە داتای هەوالگری لە جوگرافیای سیاسی زۆترین زانیاری بەردەستی هەوالگری توری (پەیوەندی کۆمەلایەتی) دەستی پێدەگات دەبێتە چاوگی نا ئەندام لە توری هەوالگری بەلکو وەك بەکاربەری دیجیتالی جیهانی جەنگ و ئاژاوەی سیاسی ئەم کەسە لەم ناوە رۆل دەگێرت، بۆچی توری کۆمەلایەتی بەخۆرایە؟ چونکە تێچووی هەوالگری کەمترین خەرچی دەستە بەردەکات، بۆوێنە ئەگەر من وەك جەودەت احمد شیکردنەوەی دۆخی ناوەخۆی هەرێمی باشوور بکەم بێ ئاگاداری من، ئەوان بە ئاسانی پێشهاتەکان وەردەگرن و کۆپی دەکەن و سەرەداوێکی دزەپێکراوی ئەم ناوچەیان بەردەست دەکەوێت بێ ئەوەی من و تۆ و ئەوی تر لە جیهانی سۆشیال میدیا ئاگاداری ئەم کردوانەبیت. کەواتە جەنگ و ئاژاوەی سیاسی لە رێگای توری کۆمەلایەتی هۆکاری یەکەم بۆ نمایش و دۆزینەوەی کەلێنی بۆشای سیاسی و هۆکاری دووەم بۆ رووخاندنی ئەم دەسەلاتەیە وەك بەهاری عەربی و ئۆکرانیا و عێراق و سودان و غەزە و ولاتانی تر.

## رێگاكانی ئەم یارییە...

**پێشهات** : دەركەوتنی ڕووداوەكان بەشێوەی ڕێژەیەی كە بە یەكگرتنی پەرتەواز ڕوودەدات.

**دواهات** : ڕووداوەكان بەفەرمی لە میدیای هێزی ناوەخۆی و دەرەكی بلاودەكرێت و بەناوی كرینەوەی (بازاری ڕووداوی هەوالگری سیاسی) لێرە سەرەتای ڕووداو بە توندی دەست پێدەكات شۆكێك بۆ جوگرافیای سیاسی و خەلك دەروست دەبێت.

**جێگركردنی جەنگ** : لێدوانی نەتەوەیەكگرتوەكان و ڕاگەیاندنی ناوەخۆی حیزبی و حكومی دەبێتە هۆشداری فراوانبوونی جەنگە كەواتە بە ئاسانی جەنگی دەستوەردانی ئقلیمی و جیهانی بەرێگای ڕێكخراوی جیهانی و میدیای دۆخەكە دەقوزنەوە وەك بەرەی هاوكاری مرۆی و گواستنەوەی چیرۆكەكان بەناوی مافی ڕزگاری مرۆڤ دەنگیان دەگەیێین بەجیهان. بەلام دیوی شاراوەی ئەم ڕێكخراو و میدیایانە، پیشاندنی شلەژانی ناوەخۆی ئەم ولاتەیە بۆ جێبەجێكردنی پرۆسەی (كرداری دەرەوونی) واتە (هەرێ هات). بە چەپلە لێدانی میدیای و ڕاپۆرتی شاراوەی ڕێكخراوی مرۆی جیهانی، فشار دەخاتە سەر درزی ڕووخانی ئەم ناوچەیە لە دوای دەرگای دواوە وە لە بەشی پێشەوە نمایشی دەستی خێرو مرۆڤایەتی پیشاندەدات.

بۆیە درێژبوونەوەی جەنگ و بەرزبوونەوەی ئاستی قوربانی ئەوكات ولاتانی هاوپەیمان بەناوی بەرگری خۆشگوزەرانی هاوكاری ڕاهێنان و لۆجستی و هەوالگری و دلسۆزی سیاسی پێش دەخان تاكو ئەم لایەنە بەسەر جەنگ زالبێت دژ بە جەمسەری ناوبڕی جیهانی.

ئەگەر بگەرێنەوە بۆ شەری ناوەخۆی كوردستانی باشور، بریتی بوو لە جەنگی سوونە و شیعە لە نێوان توركیا و ئێران بە پشتگری ئەمەریكا و ڕووسیا بەناوی دابرانی هەرێمی باشوور بۆ سنووری سوونە لە بالی شیعە و سوونە لە بالی سوونە وەك سەردەمی سنووری ئیمپراتۆریەتی سەفەوی و عوسمان لە ناوەخۆی ویلایەتی شارەزوورو موصل. ئەم جەنگە هەرێمی باشوور بۆ دوو كلتوری سیاسی و ئابووری و سەربازی مرۆی دابەشكرد.

زۆربەی نوخبەی (ڕۆشنبیرانی گەمژە) ئەم جەنگەیان بەناوی براكوژی و دابرانی حكومەت و دابەشكردنی هەرێم پێناسەیان بۆدەكرد، وە لە ئاستی دوو حیزبی بەهۆی ناهۆشیاری كادیرانی حیزب و سەركردایەتی كورد لەپێگەی باشوور بەناوی (جەنگی دۆلار دیبلۆماسی) كۆكردنەوەی (غەنیمەی) داهاتی سنوری و دامەزراندنی خێزانی حزبی بەناوی حكومەت و پەرلەمان و سوپا و ئابووری و جەماوەری ڕۆلیان گێرا، بەلام دووبارە جیهانی ناوبڕی زلهێزان فێلێكی مێژوویان لە كوردستانی باشوور كرد بەناوی ناسەقامگیری ناوچە و سنوور. ئێستا باجی ئەم مێژوو دەدەن كە حیزب پەرتەوازەبووە و خێزانی حیزب لە لێواری ڕووخانە و جیهانی زلهێزان بینەری ئەم پێشهاتاننە كە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەكاردەهێنن لەسەر هەژماری حكومەتی دووحیزبی و جەماوەری ناهۆشار و نەخوێندەوار و هەژار و نەخۆشی بەرێوەدەچێت..

پێشهاتی جەنگ بەرێگای گەرانەوە بۆ مێژوو و تیۆر و زانست و فەلسەفی سیاسی دەچێتە بواری جێبەجێكردن لە جەستەی پاكێجی هەوالگری بۆمانەوەی خێزانی حیزب و حیزب و كۆمپانیا و حكومەتێك لە شێوەی ئەنجومەنی كۆكردنەوەی مێرنشینەكان دادەمەزرێت هەر حیزب و مایكرۆ جەماوەر و كۆمپانیا، بەشێك لە جەماوەر و هێزی خۆی لێ دادەمەزرێنێت بەناوی ئۆتۆنۆمی و فیدرالی شل و لاواز.

چاوەروانی ڕووخانی حیزبی سیاسی و بێ دەنگی مایكرۆجەوامەری و خەلكی كوردستانم تاكو بزانم ناوەرۆكی ڕووداوەكان بەرەو كوێوە دەروات، بەلام 100% سەرەتا حكومەت دواتر حیزب و جەماوەر لەناودەچێت..

لێرە زۆرپێشهاتی زلهێزی و ئقلیمی هەیە لەناوەخۆی باشوور بەلام ناکرێت باس بکەین چونکە جیهانی هەوالگری وردودرشتی پۆستەکانی خەلکی باشوور دەخوێنێتەوە بەدواداچونی بۆدەکات بەرێگای چاوساخی ناوەخۆی باشووری کوردستان. هەموو ڕووداوەکان بۆ لەناوبردنی خەلکی کوردستانە و پاراستنی ئەم حیزب و مایکرۆجەماوەر و ڕێکخراوی مەدەنی کۆمپانیاکانە.

# سەرهەلدانی شۆڕەشی کلتوری دیجیتالی لە نووسیندا

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : هێزی مەعریفی
بەروار : 5ی جوولای 2024

گەرانەوە بۆمێژوو بەگوێرەی بەلگە مێژووی هەوالگری عوسمانی، بەناوی (هەولێر لە بەلگەنامەی عوسمانی)دا. دیوێکی شاراوە لەمێژووی کوردستانی باشوور ئاشکرادەکات بەناوی کەسایەتی لەپێگەی کۆمەلگا و خزمەتکردنی سوپای عوسمانی، ئەم نوخبەکەسانە لە چین و توێژی رۆحانی و میر و ئاغا و کەسی ئاسای کە خوێندەوار و کارسازی لێهاتووبوونە، بەرێگای پێدانی مووچەی بندیوار و خزمەتی سولتان و پیرۆزی سوپا لە چوارچێوەی ئاینی ئیسلام گستاندیانی پێکراوە بۆئەوەی تاك وەك هیزی جەست و هزر و رۆح دژ بە پیرۆزی داگیرکاری نەوەستێتەوە بەلکو بەرێگای پێگە و پۆست و مووچە لە دژی ناوخۆی و بەرژەوەندی پاراستنی سولتان ئەم نوخبە شازە بەکارهاتووە.

بەگوێری ناوەرۆکی ئەم پەرتووکە دەلێت خواستی نوخبە تەنها هەولی مانەوەی خۆیداوە بۆ بەرزکردنەوەی پێگەی خۆی لە ئاین و کەسایەتی و پۆست و کارسازی لێهاتوو واتە ئەم چینە زۆرترین بەشی خۆشگوزەرانی خۆیان بەسەر سوپا و عەوام سەپاندوە بەناوی (هزر، رۆح، پیرۆزی، دەستی کار). لێرە قۆناغی کۆمەلگای کوردی لە دێهات و شارۆچکە جەستەی تواوەتەوە بەهۆی نەخۆشی و نەخوێندەواری و هەژاری و چەوساندنەوەی لەلایەن نوخبەی تایبەت کە لەسێبەری زۆردرای عوسمانیەکان کاریان کردوە بەسەر خەلکدا زالکراون.

کەواتە خواستی زانست و هزر و رۆح و پیرۆزی و دەستی کارسازی لە تاك بۆمیراتی ئێستا درێژەی پێدراوە کە پێیان دەلێن خێزانی خانەدان واتە پیرۆزی میراتی مێژووی لە ناوچە و دێهات و شاردا. ئێستا ئەم پیرۆزییە بووە بە کەواسووری پێشرەوی هێزی سیاسی و خێزانی و کۆمپانیای و ئقلیمی و جیهانی. واتە میراتی چەوساندنەوەی تاك بەرێگای (گشتاندنی شکۆ) لە سەدەی 21 لە چوارچێوەی نوێبوونەوەی سەردەم و راگری مێژووی کورد و ناوچەگیری، جۆرێکە لە شکۆی شەرەف و ناوداری و بۆ ئێمە هێشتوتەوە وەدەبێت بە شانازییەوە ڕێزی بگرین و دووبارە ئەم میراتە بەرێگای چاخی دیجیتالی لەناوەخۆ و دەرەوەی کوردستان بە دیموکراتیزە بکرێت و بازاری کلتوری کوردی لەگەل خۆی نمایشی بکات.

تا ئێرە روونە بۆچی کۆمەلگای کوردی بەرەو دواوە گەرایەتەوە؟ چونکە شەقامێکی هەژار و نەخۆش و نەخوێندەوارە سەرباری بەکرێگیراوی دەرەکی بووە بۆ وەرگرتنەوەی مافی خۆی لەسێبەری هێزی شاراوەی کە دەستوەردانی لەناوەخۆی عێراق و باشووری کورستان وەرداوە. چونکە دەرفەتی هێزی دەرەکی لەرووی چاخی ئاسنین زۆرترین پارە و چەك و راهێنان و پشتگیری بۆ خێزانی کورد کراوە بەناوی وەرگرتنەوەی مافی ئۆتۆنۆمی خۆی لەعێراقی نوێدا.

### بۆوێنە سەرجەم شۆڕەشی کوردی لە رابردوو بۆ دوو ئاراستە بووە:

**ئاراستەی یەکەم :** بۆتێکدانی عێراق و پەرتەوازەی ناوەخۆی کورد بووە بەناوی هەلگیرساندنی شۆرەش و شەکەست پێهێنانی حکومەتی عێراقی نوێ.

**ئاراستەی دووەم :** لێدان لە خێزانی کورد لەلایەن داگیرکەران وەك بەریتانیا بەتایبەت سوپای ئاسمانی (رۆیال کینگ) بەخێرای وەلامی دەستوەردانی ئقلیمی داوەتەوە وە سنوورێکی بۆ عەشیرەتەکانی کوردی داناوە تاکو فێری ژیان بکرێن و بگەرێنەوە جیهانی شارستانی و مەعریف کە دوور بکەونەوە لە ژیانی (کێوی و بەکرێگیراوی ئقلیمی). لێرە سەرجەم بەلگە مێژووی لە ولاتانی ئەروووپا و ئاسیا و ئەمەریکای باکوور و رۆژهەلاتی ناوەراستی کۆن و سەرەتای دامەزراوەی رۆژهەلاتی ناوەراستی نوێ. گەواهیدەری سەرجەم راستیەکانە کە کورد لە خوێنیدا (دەماری خۆفرۆشی چەوساندنەوەی ناوەخۆی خۆخۆری کوردی) هەبووە. ئێستا ئەم میراتە بووە بە شەرعیەتی دامەزراوەی گشتی کوردستانی باشوور و دابرانی کۆمەلگای کوردی لە شەرعیەتی حکومەت و پەرلەمان و حیزب و کۆمپانیادا رەنگی داوەتەوە (بەگشتی).

خالێکی تر کە زۆرگرینگە ئێمە هەلوەستەی لەسەر بکەین ئەویش دۆزینەوەی (DNA) ئاینە لەناوەخۆی کوردستان لەسەردەمی سولتانیەکان و سەفەویەکان، بەگوێری دەقی مێژووی هەوالگری عوسمانی دەلێت زۆربەی ئەوکەسانی لە ئاینی جوولەکە و مەسیحی و یەزیدی و زەردەشتی لەترسی کوشتن و لەناوچونی خێزان و بەنەمالە و عەشیرت و تیرە بەناچاری پەنایان بردووە بۆ گۆرینی ئاین بەشێوەی تاك و کۆ، بەومەرجەی کە پێگەیان لە کۆمەلگا بەرزبکرێتەوە و مووچەیان بۆبرێتەوە و کەسایەتیان پارێزراوبێت چ لە شوێنی خۆیان یان راگواستنی بۆ شوێنێکی تر بەلام نازناوێکی پیرۆزیان بۆ دابندرێت تاکو خەلك رێزیان بگرن و دووبارە بگەرێنەوە کۆمەلگا لە پال سوپای عوسمانی کاربکەن و ببنە پردی پەرینەوەی خەلك و گەیاندنی زانیاری رۆژانەی خەلك بۆ ناوەخۆی سوپا.

زۆربەی ناوەکانی ئەم کەسانە بەم دەستەواژەیە بانگ کراوەن وەك (شێخ، سەید، نەقیب، مەلا، مامۆستا، میر) ناوەکانیان گۆراوە بۆناوی عەرەبی و لکاندنی ئەم پێشگرە بۆ گۆرینی ئەم کەسە لە جوولەکە بۆ شێخ، لە مەسیحی بۆ سەید و نەقیب و پێگەی کۆمەلایەتی. ئەمە راستی شاراوەی خێزانی کوردە لە رابردووە کە وەك میرات لەناوە ئێمە بۆتە (شێرپەنجە)، رۆژدوای رۆژ کۆمەلگای کوردی لەکورتی دەدات بەرامبەر بەمانەوەی (پیرۆزی میراتەی نەوەی ئاین گۆراوی کورد) لە مانەوەی ئێستادا.

ئەم پێشەکیە روونە، بۆچی کۆمەلگای کوردی لەم بۆشاییە مێژووە شێواوە دەخولێتەوە بەناوی پیرۆزی راگرتنی کەس و خێزان و هۆز، ئەم کاریگەرییە بۆتە مۆتەکە بۆ ئێمە چونکە دلسۆزی و رەفتاری کەمینە بەسەر زۆرینە زالە لە پێگەی راگرتنی دەسەلات و جوگرافیا و کۆمەلگا واتە بەردەوام میراتی رابردووی شێواو و وەبەرهێنانی (سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆی) بەکاردەبرێت بۆ ئەوەی ئەم نوخبە وەك (مانگی 14) رۆل بگێرت و خێزانی کورد لە گۆشەی (شەرم و دلسۆزی) قەتیس بکات بلێت (من هەم، تۆ چی؟).

لەبەر ئەمە روونە کە ئەم خێزانانە (بەکرێگیراوی سولتانی و سەفەوی و ئیمپریالیزم) بوونە. ئێستا هەمان سیناریۆی رابردوو دەگۆرێت بۆمێژووی ناوچە و شار و هەرێمی بەناوی پێگەی کورد و مقەدەساتی ئاین و عەشیرت و نوخبەی خوێندەواری بەسەر ئێمە زال دەبێت بەلام بەگەرانەوە بۆمێژوو سەرجەم کۆد و نهێنی ئەم میراتە بۆ ئێمە ئاشاکرادەبێت چۆن ئەمانە بوونە بە کەواسورەی پێشرەوەی کۆمەلگای کوردی کوردستانی گەورە و هەرێمی باشوور، سەرجەم یاداشتەکان بخوێنە بەشانوبالی کەسی و خێزانی گوتراوە وە لەسەرجەم گۆشەی پێگەی سیاسی و ئابووری و سەربازی بۆ کوردستان شەکەستیان هێناوە چونکە لە خاکی کوردی لەدایك نەبووینە بەلکو دروستکراوی هەوێنی دەرەکین بەسەر ناوەخۆ زالکراون بۆیە شەکست دوای شکەست لەبەردەوامی دایە.

ئەمە راستی یە ناتوانین عاشای مێژووی لێ بکەین چونکە ئەمانە بوون بە ئایکۆن بۆیە دەسەلاتی داگیرکەر لەسەدەی 20 راستەوخۆ مامەلی لەگەل کەمینە کردوە بۆ کۆنترۆلکردنی زۆرینەوە بەردەوامی دانی هێزی خۆی لە کوردستانی باشوور لە ئێستا بۆ داهاتوودا.

## لایەنگری داگیرکەر...

**میر --- ئاغا**

**تیرە --- خێزانە**

**خێزان --- تاك**

**تاك --- کۆمەلگا**

## بۆچی هێزی نووسین کاریگەری هەیە بەرێگای یەکگرتنی پەرتەوازەی؟

ئەوە من واتە (ئێمە) کە دەنووسین لە دیواری دیجیتالی و مالی دیجیتالی خۆت، دەبێت بە هۆشیاری مامەلەی لەگەل بکەی چونکە ئەم مالە هەمان یاسای واقعی ژیانی رۆژانەمان دەگرێتەوە واتە بەرکەوتەی کۆلان گۆراوە بۆ بەرکەوتەی شار و هەرێم و جیهان بەرێگای فیزیکی بەلام ئەم بەرکەوتەیە (شەرم و ترس و غیرەت)ی کۆنترۆل کردوە وەك تەلەفۆن چۆن لە تەلەفۆن حیساب بۆ قسەی کەسێك ناکەیت بۆ هاوکاری بەلام لەبەرکەوتی رووبەروو کە لەمالەوە لەگەلی دادەنیشیت دۆخێکی تر روودەدات ئەوکات هێزی پارەی تۆ و کەسی میوان کە داوای هاوکاری دەکات شێواویەکی پێوەدیارە بۆیە ئەم لۆژیکە بگوزاینەوە بۆ ناوە دیجیتال لە پرۆسەی نووسین ئاراستەی فراوانترە دەتوانێت کاریگەری هەبێت ە زۆرترین (عقل و هزر و رۆح و جەستە) ئاوبدات و گۆرانکاری رێژەی ئەنجام بدات بە رۆیشتنی کات دەبێتە کلتور و هێزێکی دیجیتالی رۆشنفکری عەوام سەرهەلدەدات لە پاشکۆی کۆتای هاتنی میراتی نوخبەی عوسمانی و سەفەوەی بەریتانی. واتە یەك کاتژمێر گفتوگۆ لە دوو مەتر هیچ کاریگەری نابێت بۆ گشتاندنی هۆشیاری هزری و زانستی و دەست کار بەلام لە جیهانی مەجازی بەرکەوتەی گۆرینی زیرەکی دەروونی و ژماریە و رۆحی و جەستەی گشتاندنی بۆدەکەی بەرێگای نووسین و دەنگ و ڤیدیۆ و وێنە. لێرە جیهانی هەوالگری پەنا بۆ دۆزینەوەی زیرەکی مرۆڤەکان دەبن بۆ ئەوەی رامیان بکەن و سەرکوتیان بکەن بۆبەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن.

ئەمەوێت زیاتر روون بکەوە بۆئەوەی لە کۆی 6 ملیۆن کورد لەباشووری کوردستان هەرکەسێك لە یەك هەفتە و مانگ و سالێك زۆرترین نووسین و ناوەرۆکی بلاوکراوی هزری و زانستی و کلتوری بخاتە ناو جوگرافیای دیجتالی ئەوکات ئاستی کودەتای دیجیتالی بەسەر (نەخوێندەواری و نوخبەی میراتی عوسمانی و سەوەفەی و ئیمپرالیزم سەدەی 19 و 20 و 21 زالدەبێت) وێنەیەکی نوێی کۆمەلگای کوردی باشوور لە جیهانی شۆرەشی رۆشنفکرانی دیجیتالی لە ناوەرۆکی بلاوکراوی (ئەلخەواریزم) و بەداتاکردنی کلتووری هزری و زانستی و جەستەی لە بلاوکراوەکان دەبێتە (کودەتای رۆشنفکرانی باشوور بەسەر میراتی ئیمپریالیزمدا) هێزی سیاسی و رۆشنبیرانی گەمژە ناتوانن کۆنترۆلی شۆرەشی رۆشنفکری دیجتالی بکەن چونکە کۆنترۆلی وەبیرهێنانەوە و نمایشی ناوەرۆکی بلاوکراوەکان لە پێگەی تۆری کۆمەلایەتی و ئامێری (ئەلخەواریزم) لەدەست کۆنەپەرستی ناوەخۆی باشووری کوردستان نیە بلکو لە ولاتی خۆیدایە کۆمپانیا دەتوانێت کامە جۆر پۆست (بلاوکراوە) و ناوەرۆك بگات بە بینەر و بەکاربەری مالی دیجیتالی. بۆیە شۆرەشی کلتوری رۆشنفکران بۆ گشتاندنی عەوام دەتوانین هەنگاوێك لە سیستەمی (دیبلۆماسی تاك بە جیهان بگەێنین) چیتر نوخبەی میراتی ئیمپریالیزم ناتوانێت ئەم بۆشایە پربکاتەوە کۆمەلگای کوردی لەسەردەمەی جیهانی چاخی دیجیتالی دوابخات و ببێتە پرد بۆپەرینەوە بەسەر پشتی عوامی (هۆشکراوە) بۆنمایشی خۆی و لایەنگر و مانەوەی لەم سەردەمەدا.

دەمێکە بیر لەم گۆرانکاری دواکەوتوی خێزانی کوردی هەولی بۆدەدەم ئەوەندەی گەرام لە جیهانی مەجازی و پەرتووك هیچ رێگایەك نەبوو بەخێرا ئەم گۆرانکارییە بکات، لەدوای 18ی رەمەزان کە لەسەر نووسین بەرێگای درۆن تەهدیدکرام بەناوی (کوشتنی پێشوەخت) ئەوکات بیرمکردوە کەمن هەم، دەتوانم هێزی خۆم تاقی بکەوە بۆ گۆرینی کۆنەپەرستی بۆ نوێبونەوەی زانستی و دیجیتالی باوەربکەن بە بلاوکراوەی ناوەرۆکی نووسینەکانم (سوپای ناتۆ و ئەمەریکا) بۆماوەی زیاتر لە 2 مانگ چاودێری ئاسمانیان بەسەرمەوە دەکرد، بۆ ئەوەی بزانن من سەر بەچ لایەن و گروپ و دەستی دەرەکیم، دواتر بۆیان رۆن بووە کەم کەسێکی ئاسای و خوێنەرێکی خەلکی باشوورم دوورم لەهەموو ئاژاوەی سیاسی و ئابووری و هەوالگری ناوەخۆی کوردستانی باشووم. بۆیە لەدوای ئەم بەیەکگەیشتنی نووسینی دیجیتالی و فشاری هەلسانی درۆن لە فرۆکەخانەی هەولێر، درزێك (کەلێنك) لە سیستەمی سیاسی ئیمپریالیزمم دۆزیەوە کە ناوتوانێت بەسەر کورد زالبێت ئەگەر لەرووی هزری و زانستی و رۆحی و جەستەی لە قالبی (رۆشنفکری) دابمەزرێت ناتوانێت داگیری بکات و بیروخێنێت بۆیە کە باسی هێزی نووسین شۆرەشی دیجیتالی دەکەم هێزێکە هیچ کەسێك ناتوانێت کۆنترۆلی بکات و رێگری بکات بەلکو جۆرێکە لە فشاری ئاراستەکراوی دیجیتالیە بەسەر دەروونی دەسەلاتی ئقلیمی و جیهانی زالە. **بە دوو ئەگەر...**

**یەکەم :** بەکارهێنانی مۆبایل لە هاژۆشتنی ناوەرۆکی بلاوکراوەکان تەنها پەنجەی گەورەی دەستی راست زالە بەسەر شاشەی مۆبایل ئەمە بۆچی وایە؟ چونکە بۆ تێگەیشتن لە دۆخی رووداوەکانی مرۆڤ نەیار شەیدادەبێت هێزی جەستی و دەردانی رژێنەری خۆشی و ناخۆشی راستەوخۆ بەسەر دەستی راست زال دەبێت و بە هێزی پەنجەی گەورە شاشە دەگوشێت و تورەی لەجەستەی خۆی دەخواتەوە دەبێتە تێکدانی دەروونی ئەم تاکە لەم هێزەدا. بەناچاری فشار دەخاتە سەرسوپا بۆ دۆزینەوەی نوخبەی رشنفکرانی کوردی لەناوەخۆی کوردستانی گەورە و هەرێمی باشوور، ئەمە راستیە کە بەسەرمندا هات بەهاوکاری چاوساخانی کورد مردنی مینا پێشخست لە سەرنووسین و نوێبوونەوەی کلتوری کوردی لە بەکابەر بۆ هێزی هزر و زانست و دەستی کار.

**دووەم :** هێزی لاوازی سیاسی و حکومی و حیزبی ئەم ناوچەیە دەردەخات کە عەوام لە هێزی شاراوەی رۆشنفکری بەهێزترە لە دامەزراوەی گشتیدا، بۆیە شەرعیەتی سەروەری (خەلك و خاك) لە پێگەی هێزی زلهێزان زیاتر ترسیان لە خەلکە نەوەك حیزب و حکومەت و پارە و چەك. ئەمە راستی لێکۆلینەوەی من بوو لە تێگەیشتن لەناوەرۆکی هێزی زلهێزانی جیهان.

**ئەگەر توزێکی تر قولبینەوە بۆچی بایەخ بە فەلسەفە و هزر نادرێت بۆچی زانستی زانکۆ بووە بە زانیاری زانستی کرچوکال؟**

**بۆچی پرۆژەی زانستی خۆبەخشان کرچوکال و لەناوبردران؟**

**بۆچی 11ی سێپتەمەبر کاری لەسەر (هزر)ی کرد و گۆری بۆ تیرۆر و لەناوبردنی پێگەی (هزری فەسەفەی و دەرخستنی زانستی و وەبەرهێنانی بۆ بەکاربەران)...؟**

## باپوختی بکەمەوە..؟

**لە ولاتانی پیشەسازی و داهێنان لەناو پیشەسازی بۆچی لەسەر سێ ستوو دامەزراوە؟**

**ئێمە بەردەوام هەست بەخێرای گۆرِانی دەوروبەردەکەین بۆچی؟ چونکە ولاتانی زلهێزی دوو بازاری هەیە.**

**یەکەم :** بازاری نوێبونەوە واتە سەری سال تەواونەبووە بەرهەمی نوێ دەخرێتە بازار بە (سیگمەنتەیشن) واتە هەمەجۆری لە قەبار و نرخ و کوالێتی بۆئەوەی بەرێگای (ریکلام) هۆشداری بدات بەناوەخۆ لە نوێبوونەوەی بەرهەمەکان لەگەل خواستی (زیرەکی دەروونی و هەژمارەی عقل) بگونجێت و بەخێرا کاریگەری فرۆشی زیادبێت. ولاتانی سێیەم و دەبێتە پردی دەسەلاتی پەرینەوەی (سیاسەتی ئابوری کۆمپرادۆری) واتە (دەراری بازرگانی) لێرە ئەم دەرارە هیچ بایەخ بەوەبەرهێنانی ناوەخۆی نادات بەلکو بۆ ئەوەی ئەم کالایە هاوردەکراوە ساخ بکاتەوە لەجیاتی کاری ناوەخۆ ببێتە هێزی مانەوەی ئەم هەرێمە و وەلاتە لە دەسەلاتدا، بۆیە باجی کەم دەخاتە سەر تاکو خواستی فرۆشتن زیادبێت و پێگەی حیزب و حکومەت و خێزان و کۆمپانیای دەراری لە دەسەلات بمێنتەوە.

**دووەم :** کالای کۆن کە تەمەنی 2 مانگ ماوە لەسالێکدا لەرووی بازاری، بەنرخێکی هەرزان دەفرۆشرێت لەناوەخۆ و دەرەوەی ولاتانی پیشەسازیدا وەك ئەمەریکا و ئەورووپا و ئاسیای پیشەسازی. ئەگەر وردبینەوە لەناوەخۆی کوردستان ئەم ئۆتۆمبێلانە دەفرۆشرێتە ولاتانی سێیەم کەلەرووی هەژاری و داهاتی تاك کەمە وە نوخبەی کەمینە بەسەر زۆرینە زالە لێرە بازاری هەژار بە کۆنەمۆدێل پردەکرێتەوە وە بازاری دەولەمەند بە نوێبوونەوەی مۆدێل جوانی دەسەلاتی سیاسی ولاتانی سێیەم و پیشەسازی هێزی مانەوە و پیشتی وان بەرزدەبێتەوە. واتە لە ولاتانی پیشەسازی، چینی دەولەمەند بەشێکە لە بازاری نیولیبرالی و پیشاندانی هێزی حکومەت و حیزب و دەولەت و هەرێم. بەلام لە ولاتانی سێیەم جیاواز و تێکشکاوی ناوەخۆی بە جوان راگرتنی نوخبەی کەمینە بەسەر زۆرینە.

ئێستا روون بۆتەوە بۆچی ئەم حالەتە روودەدات؟ ئەمە وێنەی هێناوەی هزری بوو بۆئەوەی ئێمە لە رەگو ریشەی دەسەلات و کۆمەلگا تێبگەین بۆچی لە سەدا 80ی داهاتی جیهان بۆ خێزانی سەدا 20 وە لە سەدای 80ی خەلکی جیهان داهاتیان سەدای 20ی واتە تۆ هەژار و هەژارتردەبێت ئەوان زیاتر دەولەمەند دەبن.

**کەواتە سووتی ولاتانی پیشەسازی (هزری فەلەسەف و زانست و بەکاربەر) دەگۆرین بۆ ئابووری بەکاربەری جیهانی چونکە پرۆژەی 11ی سێبتەمبەر لێدانێکی شاراوەی زانستی و پیشەسازی و ئابووری مرۆی گەلان بوو. باروونتر بکەمەوە..**

**هزری فەلسەفەی :** واتە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی (دیزاین کردنی ئۆتۆمبێل و مۆبایل و پێداویستی رۆژانە). لەرێگای هزرەوە دەئافرێت.

**زانست عقلی :** ئەم نەخشە هزرییە ئەبستراکەتە واتە ئەم قەبارە نابەرجەستەیە دەگۆرێت بۆ مادە و بەرکەوتنی مرۆڤ و دەورەبەر، برۆسەی زانست لە خەیال دەکاتە راستی.

**دەستی بەکاربەر :** ئابووری مرۆی گەلانە کە وەك صین سەرجەم بەرهەمەکانی بەدەستی کرێکاری ناوەخۆی و لە هزر و زانستی صین دامەزراوە بەسەر ناوەخۆ و جیهان بەبازار دەکات. ئەگەر کورد بیربکاتەوە دواتر بیکاتە ئۆتۆمبێل و لەکۆتای خەلکی کوردستان لەشەقامی باشوور ئەم ئۆتۆمبێل بەکاربهێنن دەبێتە هێزی پیشەسازی دەرهاوێشتەی شۆرەشی هزری و زاسنی و بەکاربەری لە چوارچێوەی رۆشنفکران و هۆشی عەوام بەرهەم هاتووە، بۆیە جیهانی زلهێزی، پرۆژەی کۆیلەی گۆری بۆ پەنابەر بەرێگای ئاژاوەی سیاسی و جەنگ و برسیەتی دەست بە دزینی (زێری سپی) کرد، جەنگی کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال دیموکراسیەکان جۆرێکە لە بەرپاکردنی ئاژاوەی ناجێگری نرخی سمانی سروشتی و دراو و جەنگی پرۆکسی و ئاژاوەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی لەناو جیهاند بەرپادەکەن ئەم دوو جەمسەرە بۆ هێشتنەوەی کۆمەلگای مرۆڤایەتی و هەلوەشەنادنەوەی هەمان خێزانە.

لێرە نووسین لە گۆشەی  هزر و زانست و بەکاربەر دوردەخرێتەوە دەیخەنە پرۆژەی هزری تیرۆر بەناوی تێکدانی زەوی و بەرژەوەندی زلهێزان لەناوەخۆی جیهان و هێشتنەوەی دەسەلاتی ناسیاسی و نالۆژیکی لەناوەۆخی هەرێم و ولاتاندا، هەرێمی باشوور بەشێکە لەم پرۆژەیە بۆیە کۆمەلگای کوردی دەبێتە بەکاربەری ئابووری هاوردە و پرۆسەی بەفیرۆدانی مرۆڤ.

نووسین بەرێگای شۆرەشی کلتوری دیجیتالی لە چینی هۆشی عوام جۆرێکە لە خۆرێکخستنەوەی ناوەخۆی کوردستان و کوردستانی گەورە لە دایك دەبێت، ئەوەی ئەرکە لەسەر ئێمەی خەلکی کوردستانی باشوور تەنها نووسینی پربەپێست و دوور لەناوهێنان و جوندان و ئاراستەکردن بێت تەنها بە دیجیتالکردنی ناوەرۆکی ژیانت لە دێهات و شار و شارۆچکە دەبێتە شۆرەشێکی رۆشنای گۆرینی کۆمەلگای کوردی لە هێزی کۆمپاردۆری و میراتی ئیمپریالیزم بۆ کودەتای رۆشنفکری و ریفۆرمکردنی ناوەخۆ و ئقلیمی و جیهانیە.

## بۆوێنە لە جۆرەکانی ناوەرۆکی نووسین.

1- نوسینی مێژووی کە باس لە ناوچە و دێهات و شاری خۆت دەکات ئەگەر سەرچاوە نەبوو، دەتوانێت رووداوەکان لە رێگای دایك و باوك و دراوسێ و خەلك دەستت بە ناوەرۆکی رووداوەکان بگات  بنووسە و بە تێروتەسەلی لەگلە بۆچوونی خۆت بە درێژی بنووسی و بلاوی بکەیتەوە.

2- نووسینی کلتوری کەباس لە نەریت و گۆرینی رابردووی کۆنەپەرستی بۆ نوێبونەوە لە چاخی دیجیتالی بۆ زاستی هزری و بەکابرەی نەوەك (چەلەحانێ بەلارێبردنی کۆمەلگابێت بەناوی بێ دین و بێ زانستی و دیموکراسی نوێنەری.

3- نووسینی هزری پەتی کە بەرکەوتنی تۆ لە رابردوو بۆ ئێستا، دەتوانێت ناوەرۆکی پوخت لە هزری تاکی کورد لەناو فەلسەفەی نوێبوونەوەی خێزانی کورد گەشە بکات دەبێتە میراتی گۆرینی باشوور بۆ نوێبوونەوی لەسەرخۆ.

4- بنووسە، وێنە بگرە، ڤیدیۆ بلاوبکەوە و دەنگ تۆماربکە، بۆ ئەوەی دەنگی تۆ لە پێگەی گۆرینی کۆمەلگای کۆنەپەرستی بۆ جیهانی نوێبوونەوەی دیجیتالی لە کۆتای هەر سالێك دەتوانی پەرتووکی دیجیتالی و کاغەز بلاوبکەیتەوە لە عەقلی پەتی خێزانی کوردی بۆ نوێبوونەوە رزگاربوون لەم دۆخە ئاراستەکراوە.

**لەکۆتای دەلێم....**

**مردن لەسەر نووسین، بەشەرفترە لە کۆچکردن بۆ دەرەوەی ولات و کۆیلەی کاپیتالستی بیت.**

**مردن لەسەرنووسین، سەرشۆریە بۆ ناوەخۆی دەسەلاتی کوردی بۆ رازیکردنی ئیمپریالیزم.**

**مردن لەسەر نووسین ریفۆرمی شۆرەشی کۆنەپەرسیتی خێزانی کوردە لە چاخی دیجیتالی و سەدەکانی داهاتوودا.**

# سیاسەتی شاراوەی ئەمەریکا

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : لەدەستدانی دەرفەت
بەروار : 6ی جولای 2024

ئەمەریکا بەردەوام پشتگیری هێزی ئەقل دەکات، وێنەیەکی بچووك لە 2024 جەنگی پرۆکسی نێوان صین و تایوان، بەگوێرەی مێژوو، چۆن دەشتی ناوکوڕ لە نێوان موصل و هەولێر و دهۆك بەیەکەوە لکاوە لە (قۆچانی بەریتانی) کەسەر بەموصلە بۆئەوەی ئەم دەشتە نەچێتە سەر هەرێمی باشوور لە داهاتوودا، بەهەمان شێوە بەریتانیا راستەوخۆ لە رابردوو پێگەی تایوانی بە خاکی سەرەوەری صینی کۆنی گرێداوە، بەلام ژیری تایوانیەکان و هێزی عقلی خۆیان لە پیشەسازی بەرهەمهێنانی چاخی دیجیتالی گەشەپێداو داهاتی سالانەیان (400) ملیار دۆلارە لێرە هێزی بازاری کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال دیموکراتی داگیرکرد، ئەمەریکا و پێگەی بایدن و دیموکراسەکان راستەوخۆ لە جەنگی ئۆکرانیا پشتگیری تایوانیان کرد بۆ دروستکردنی ئاژاوەی سیاسی و دارەمانی ئابووری صین بەهۆکاری فشارخستنە سەر ناوەخۆی ئاسایشی ئابووری صین و تێکدانی بەرژەوەندی رووسیا. واتە جوولەیەکی سیاسی و بردنی لقێك لەم کۆمپانیا بۆناوەخۆی ئەمەریکا بۆئەوەی جەمسەری کۆمەنیستی نوێ و بالی رووسیا نەتوانن بەئارەزووی خۆیان بەرێگای ولاتانی سێیەم و بازاری ڕەش دەستیان بە (چیپ) بکەوێت بۆ فراوانکردنی جەنگی ئۆکرانیان و هێلی کۆمەنیستی نوێ لە رۆژهەلاتی ناوەراست و جەمسەری بەستەلەکی باکووری زەوی و هاوسنووری ئەرووپا.

لە پێشانگای تایبەت لەناوەخۆی رووسیا بەرێگای پەخشی فەرمی ئارتی رووسی و نوێنەرایەتی رووسیا لە یوئێن بەگالتەوە باسی کوالێتی بەرهەمی چەکی ناتۆکراوە بە یاری منالان هەلسەنگاندنی بۆکرد چونکە ئێران رۆلێکی گەورە هەیە لە سیستەمی (کراك) کردن کە ژیری و زیرەکی شیعەی ئێرانی توانای گۆرینی چەکی ناتۆی هەیە بۆ قەبارەی بچووك و خێرا و کۆپیکردن و گۆرینی شێوازی ئەم چەکانە دووبارە لەرێگای ولاتانی سێیەم بەکرێنەوەی (چیپ و کامێرا و پاتری) پێداویستی زیرەکی خورێیەری چەکی خۆکوژی و بەکابەری مرۆڤ لەناوەخۆی ئێران بەرهەمهات و بەگوێری بەلگە مێژووی میدیای جیهانی دووبارە لەناوەخۆی رۆژهەلاتی ناوەراست و جەنگی ئۆکرانیا بەکارهات. بەم جۆرە سیاسەتی (کراککردن) دەلێن هێزی عقل لەناوبری زلهێزاندا.

بۆچی تا ئێستا ئیسرائیل چەکی (گومبەزی ئاسنین) سیستەمی دژە ئاسمانی بە ئۆکرانیا نەداوە؟ چونکە هیچ گرێنتی پاراستنی ئەم چەکە نیە لەناوەخۆی ئەم ولاتە و زۆنی جەنگ لە نێوان رووسیا و پشتگیری ناتۆ. ترسی ئیسرائیل لەوە بوو ئەم سیستەمە بکەوێتە دەست رووسیا و صین و ئێران. لە مێژووی سیاسی جیهانی لەدوای جەنگی سارد و سەرهەلدانی چاخی دیجیتالی، پێگەی ئەمەریکا لە دەسەلاتی سێبەر جۆرێك لە گالتجاری سیاسی بەرهەم هێنانەو بەناوی ئازادی سیاسی بۆ هەموو چین و توێژێك کە دەسەلات بگرێتە دەست و حکومەرانی بکات لە حیزب و حکومەت و دەولەت و هەرێم. ئەم پرۆسیە ناوی ناوە (کرداری دەروونی) بۆ تێکدانی هەستی نەتەوایەتی و پێگەی جەماوەری و خاك و نان و تێکدانی ئاشتی ئەم ولاتەیە.

کەواتە بێنرخکردنی سیاسەت و پێگەی دەولەت و حکومەت بۆ نمایشی گالتەجاری بەرامبەر بە رووسیا و صین و بالی کۆمەنیستی نوێ و گروپی برێکس جۆرێکە لە نمایشی سیاسی (سوکوچروکردنی دەسەلاتە) لە جیهان بەرێوەدەبات بۆئەوەی هێزی کۆن و کۆنەپەرستی نەتەوەی و خاك لەچوارچێوەی گالتەجاری کەسایەتی کۆمیدی و تورفرۆش و گۆرانبێژ و مەلا و و میدیاکار لە پەرلەمان و حکومەت و نوخبەی تر دەخاتە بواری جێبەجێکردن وێنەی ئۆکرانیا لە پێگەی سەرکردەیەکی کۆمیدی و پەرلەمانی کوردستان لە پێگەی عەوامێکی نازانستی سیاسی جۆرە پەیامێکی نەرم و رێژەی بوو لەرۆژهەلاتی ناوەراست و جەمسەری ئەمەریکا و رووسیادایە.

ئەگەر بگەرێینەوە بۆناوەخۆی عێراق لە پرۆژەی 11ی سێبتەمبەر گۆرینی ئاراستەی (هزری فەلەسەی و زانستی پەتی و چالاکی خۆبەخشی وەبەرهێنانی تاقیکردنەوەی زانستی) گۆری بۆ بەکاربەری ئابووری بۆئەوەی پرۆژەی هزری بە هاوپێچەی ناوەرۆکی (تیرۆر) گرێبدات هیچ گەلێك و دەولەتێك نەبێتە پێشرەوی پیشەسازی و زانستی و خۆبەخشی لە سەردەمی چاخی دیجیتالی. بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆژەیە جەنگی 2014ی تیرۆر لە عێراق و سوریا گەشەی پێدا جۆرێك لە کۆچی زۆرەملێی لەناوەخۆی ئەم دوو ولاتە بووە هۆکاری نوێبوونەوەی کەرتی پیشەسازی و ئابووری مرۆی واتە کۆچی ئاراستەکراوی ئاژاوەی سیاسی و جەنگی پرۆکسی و برسیەتی وەك کارنامەی پرۆژەی کۆیلەی کۆن لەناو جیهانگیری ئابووری دارژایەوە. واتە بردنی کۆیلە کۆتای هات بەلام کۆچی کۆیلەی مۆدێرن بەرێگای جەنگ و ناسەقامگیری نوێکرایەوە لە پرۆژەی سیاسەتی ئەمەریکا. بۆیە گروپی برێکس و رووسیا رێگری لەم پرۆژەیە دەگرن بەناوی بردنی (زێری سپی) واتە دزینی عقل و هێزی جەستە لەناو پرۆسەی کۆچی کۆیلەی مۆدێرن.

کەواتە جەنگی شاراوەی ئەمەریکا بەم ڕێگایانە درێژەی پێدەدات بەناوی دیبلۆماسی (سەفارەت و قونسول) لەرووکار کلتور و هاوبەشییە لە ناوەرۆك جێگرکردنی دەسەلاتی ئەمەریکایە بەسەر جیهاندا. کەچی گەمژەی سیاسی کادیری حیزب لەناوەخۆی میدیای کوردی دەڵێت ئەم دوو لقە کە سەفارت و قونسول کاری کلتوری و دبلۆماسی دەکەن، ناهۆشیاری کادیری پێشکەوتی حیزب لەناوەخۆی هەولێر ئەم دۆخەیانە بەم ڕۆژەگەیاند گە تێگەیشتنی پەتیان نەبوو بۆ هێزی ئەمەریکا.

کەواتە سیاسەتی شاراوە بریتیە لە ئاژاوەی ناجێگیکردنی نرخی دۆلار و بەردەوامی فشاری دبلۆماسی بۆ ناوەخۆی جیهان لە بەکارهێنانی دۆلار بۆ بوژانەوەی دارای حکومەت و دەولەت لە جیهاندا سەرباری جێگرکردنی سوپای ئەمەریکا بەرێگای یەکگرتنی پەرتەوازی تاکو قەبارەی هێزی ئەمەریکا لە جیهان نمایش بکات و لەکەمترین ماوە، وەلامی خێرای هەبێت بۆ جەنگی سەروەری ئەمەریکا و سوپا و پێگەی ئۆپۆزسیۆنی ناوچەگەری.

**بۆچی ئەمەریکا لەرێگا سوپا و ئالا و خاك نمایشی خۆی دەکات لە جیهاندا؟**

هەرولاتێك پرۆژەی سەربازی زۆرەملێی هەبوو، کەوتنی ئاسانە لە ناوەخۆی ئەم ولاتە بەهۆکاری دژە ئاراستەی سیاسی بۆیە عێراق وێنەیەکی سەرەتای سەدەی 21 بووکە، لەکەوتنی لەناکاو، بالی بەسەرداکێشا بەهۆی کێشەنانەوە لە ناوەخۆی ئقلیمی. بە پێچەوانەوە سیستەمی سەربازی کراوە بەئارەزووی (خوێن بەخشین بۆمانەوەی ئەمەریکا) لە پێکهاتی گەلانی جیهان. پرۆسەی ئابووری ئەمەریکا لە دۆلار جێگرکراوە وەك تاکە دراو لەجیهاندا لەپال ئەم دراوە سوپا پشتگیری راگرتنی نرخ و ئاژاوەی سیاسی و پرۆکسی بەرێوەدەبات لێرە ئالا و ناوی ئەمەریکا بەگەشاوی جێگردەبێت کە پێی دەلێت (گەورەی ئەمەریکا). نازانم کورد بۆچی پەند لە مێژوو وەرناگرێت؟

لەدوای هاتنی بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست سیستەمی کەنێسای زیندوکردەوە بەرێگای پزیشکی تایبەت و گشتی لە پێگەی رۆحانی ئاینی مەسیحی جۆرێك لە دلسۆزی و گۆرینی رەفتاری تاك لەناوەخۆی پێکهاتەی نەتەوەنشین رۆژهەلاتی ناوەراست قۆستەوە، واتە گەرانەوەی پێگەی مەسیحیەت بۆخاکی خۆی و هاتنی ئەمەریکا بۆ سەرمێزی سیاسی و سەربازی و ئابووری و مرۆی بە پۆلینکردنی نەفت و دەسەلات و پێگەی بەرژەوەندی دامەزراند، وێنەی کەنداوی عەرەبی بەشێکە لەراگرتنی ئەمەریکا بۆیە هێزی کۆمەنیستی نوێ دژە فشاری خستە سەر ناوەخۆی رۆژهەلاتی ناوەراستی نوێ بەناوی ئابووری ناوەخۆ و لایەنگری لە گرووپی برێکس، ئێستا سعودیا لەنێوان رووخانی ئەمریکا و هەلسانەوەی سەربەخۆی پشتگری برێکس یاری مەرگ دەکات.

عێراق بەشێکە لە بوژانەوەی برێکس بۆ ئەوەی ئەمەریکا خۆی لە تێچووی هەلسانەوەی عێراق نوێ رزگاربکات و ئاژاوەی بەرژەوەندی و دژ بەرێوەدەبات لە نێوان ج7 و برێکس. ئابووری ئێستا بەندە لەسەر (کارنامەی سەوزای، ئۆتۆمبیلی خۆهاژوکار، زیرەکی خۆرێیەری، داهێنان لە پیشەسازی، گۆرینی ئاراستەی گەلان لە داهێنان بۆ بەکاربەری ئابووری سەرنجراکێش). کەواتە هێزی شاراوەی ئەمەریکا لە نیولیبرالی بۆ ئابووری جیهانگیری درێژدەبێتەوە.

چەمکێك هەیە بەناوی (ئاپۆکلیپس) واتە (خودای سەرزەوی) لە پێگەی مرۆڤ، ئەگەر بگەرێنەوە بۆ جەنگی رووخانی ئیمپراتۆریەکان تا جەنگی چاخی دیجیتال لەنێوان کۆمەنیستی نوێ و ج7، ئەم خودایە شاراوە لە جیهانی دەسەلاتی گەلان بەردەوام جۆرێك یاری (کوشتن و برسیەتی و نەخۆشی) دەئافرێنت بۆئەوەی کۆچی مرۆڤ لەشوێنی جیاواز بگوازێتەوە بۆ ولاتانی پیشەسازی و دروستکردنی بۆشای تیرۆر و گۆرینی ئاراستەی ژینگەی زەوی بۆ گەرم بوون و هەلوەشاندنەوەی خێزان بۆ رۆبۆت و هاورەگزبازی و سوپای سوپەرپاورە لە تاقیگەی زیرەکی دەستکرد لە دایك دەبێت هیچ یاسا و مافێکی مرۆڤی بۆدابین ناکرێت بەلکو وەك کالا وایە بۆ چاودێری مرۆڤ و جەنگ و ژینگەی زەوی و ئاسمانی. کەواتە کارنامەی خودای سەرزەوی واتە ئاشکراکردنی هێزی شاراوەی گەلانە و لەناوبردنی هێزی کۆن بۆ نوێ و گۆرینی بۆ گالتەجاری سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆییە.

بۆیە هێزی ئەمەریکا لە جەنگی یەکەم و دووەم لە پێگەی پیشەسازی کاپیتالیستی کۆچی گەلان دامەزراوە لە چوارچێوەی دەستووری ئەمەریکا کە لە سالی 1787، هەموو کەسێك خزمەت بە ئەمەریکا دەکات بەلام سەروەری ئەمەریکا لە خوێن و عقل و هێزی ئەم تاکە کۆتای دێت واتە ئەمەریکای گەورە هەموو قوربانیەك لەپێناو مانەوەی ئالا و شکۆ و سوپا و دۆلارە. بۆیە جیهانی ئۆپۆکلیپس وەك (قەصاب) گۆرانکاری لەناوخۆی ولاتان و هەرێم و بەرێوەدەبات کە هیچ هەست و سۆز و بەزی بەم لەناوبردنە نیە چونکە هێزی نەرمی ئەمەریکا لە چوارچێوەی بێ بەزەی لەناوبردنی یەکجارەکی بەرێوەدەچێت. جیهانی پیشەسازی وەك جیهانی بەکاربەری نیە بەلکو لۆژیکی ژیری و هێزی لە جیهانی پیشەسازی بەهێزترە نەوەك جیهانی هاوردەی چونکە ولاتانی هاوردە لەرووی دەروونی سۆز و رووخانی زیاتر لەسەر لە جیهانی کاپیتالیستی و پیشەسازیدا.

**کەواتە ئاراستەی ئەمەریکا لەرابردوو بۆ داهاتووی بەردەوام کار لەسەر ئەم پرۆژانە دەکات کە بەهاوبەشی جەمسەری مەزهەبی لینینی نوێ و نیولیبرال دیموکراسەکان لەناو هێزی شاراوەی کاپیتالیستی بەرێوەدەچێت.**

1- کودەتای جەماوەری دژ بەناوەخۆی حیزب و لایەنگر و حکومەت.
2- کودەتای هەلبژاردن دژبەناوەخۆی حیزب و سەرخستنی ئۆپۆزسیۆن.
3- کودەتای سەربازی بەرێگای پەروەردەکردنی سوپا دژ بەناوەخۆیدا.
4- هێزی هاتنی کەسی سیاسی سەربەخۆ بۆگۆرینی دەسەلاتی کەمێنە.
5- گۆرانکاری کەشوهەوا بۆ گۆرینی دیمۆگرافیا و بۆشای ئاسایشی خاك.
6- چاخی دیجیتالی بۆ لەناوبردنی پارە و کار و کۆنترۆلکردنی مرۆڤ.
7- جەنگی دۆلار لە ئاژاوەی سیاسی و داتەپاندنی ئابووری گەلان.
8- جەنگی گروپی بۆ بەرپاکردنی پرۆکسی و تیرۆر و مادەی هۆشبەر .
9- بومەلەرزە و لافا دوو ئامرازن بۆ تێکدانی دەسەلات و رووخاندنی.
10- پرۆژەی (مانگرتنی عینادی سیاسی) بۆ لەناوبردنی کەسی سیاسی و حیزب دوور لە پێگەی خێزان و خەلك تاکو تێچووی گۆرانی دەسەلات کەمتر بێت.
11- گۆرینی سەرچاوەی وزەی ستومەنی لە نەفت و گاز و بەنزین بۆ هایدرۆجین و یۆرانیۆم کە ئەم دوو مادەیە پیشەسازی ئاسن لەناودەبات.
12- لەناوبردنی پیشەسازی ئاسن بۆ سیستەمی (نانۆ) و سوتەمەنی سەوزای وەك تێسلا و کارپێکردنی جیهانی تەکنەلۆژیای ئێستا.

کەواتە هێزی ئەمەریکا لە کلاسیك گۆراوە بۆ ئولترامۆدێرن واتە نوێبوونەوەی خێرا و گەشە و بەهێز لە پێگەی دیبلۆماسی هاوبەش وەك کردنەوەی لقێکی ئەم پیشەسازیانە لەناوەخۆی ئەمەریکا و گۆرینی زانست و هزر بۆ ئابووری بەکاربەری دیجیتالی و چاودێری دیموکراسی پۆلیسی لەناوەخۆی جیهاندا.

پرۆژەی هەواوی دژی ئەپەل کە بەرژەوەندی ئەمەریکا و ناسا و سوپا لەناوەخۆی جیهان خستوتە پەلەقاژەوە. بەلام واشنتۆن بەردەوامە لە بەهێزکردنی پێگەی خۆی بۆمانەوە لە جیهاندا، ئەگەر تۆزێك وورد بینەوە لە تورکیا ئەوا هەلەی ئەنقەربوو کە خۆی خستە ناهۆشیاری جوگرافیای سیاسی لەلایەن رووسیا فشاری خراسەر بۆ ئەوە فلەند و سوێد نەبێتە ئەندام لەناتۆ تاکو کاریگەری نەبێت لەسەر وەبەرهێنانی سامانی سروشتی لە جەمسەری باکووری زەوی، لێرە کێشەی پیشەسازی تورکیا بۆ وەبەرهێنانی سەربازی کێشەی تێکەوت لە کرینی فرۆکی جەنگی ئەمەریکا و بەرامبەر بە س400 رووسی، هۆکارەکە روونە کە ئاسایشی ئەنقەر لەمەترسی دایە بەهۆی لەدایکبوونی هەرێمی رۆژئاوا لەلایەن ئەمەریکاوە هەرکات تورکیا کێشەی جوگرافیای سیاسی ئافراند، واشنتۆن راستەوخۆ بەرێگای کوردانی باکوور فشاری دەخاتە سەر ئەنقەر لە شەقامی باکووری کوردستان و کۆکردنەوە خێزانی کورد بەناوی ئازادی سیاسی و دادپەروەری خۆپیشاندان بەرێوەدەبات.

بۆیە ناهۆشیاری ئاکەپە و عینادی سیاسی گەورەترین زیانی بەرکەوت لە هەڵبژاردن، ئەگەرێکی زۆرهەیە ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی جێگای سیاسەتی ئاکەپە بگرێتەوە سیستەمی عوسمانی ئیسلامی مۆدرێنی سونی لەناوبەرێت بەدوو رێگا..

لێدان لەلایەن یەکەکە بەهاوکاری واشنتۆن بۆرووخاندنی ئەنقەر لە پێگەی ناتۆ و دورخستنەوەی تا تورکیا نوێ دادەمەزرێت لەدوای ئەم هەڵبژاردنە. وە لێدان لەلایەن یەکەکە بەرێگای پشتگیری کۆمەنیستی نوێ بۆ ئەوەی بلانسی تورکیا لە جەنگی ئۆکرانیا وەك ناوبژوان بیروخێنێت و گۆرانکاری لە ناوەرۆکی سیاسەتی ئەنقەر و پەرلەمان و گەلی تورکیا بکات.

هێلی مێگاپرۆژەی تورکیا بۆ فاو، ترسی ئاسایشی ناوەخۆی عێراق و قەندیلی لەسەر لە گۆشەی شەنگال و رۆژئاوا و موصل. ئەگەر ئابووری کۆمەنیستی نوێ هەرێمی باشوور قفل بکات بەرێگای ئاژاوەی پارتیزانی ئەم ئابووریە یەکی دەکەوێت، باشترین چارەسەر پرۆژەی ئاشتیە لە نێوان ئەم جوگرافیای جێبەجێبکرێت.

کەواتە پێگەی هەولێر لەدوای گواستنەوەی بنکەی دبلۆماسی ئەمەریکا لە لیبیا بۆ هەولێر سیناریۆی دووەم دێتە جێبەجێکردن لە روخاندنی سنووری برێکس و ولاتانی هاوسنووری ئەم جەمسەرە لە پێگەی مێژووی و خاك و درێژکردنەوەی پرۆژەی ئیبراهیم بۆ ئاشتی و جەنگ. دۆخی ناوەخۆی هەولێر و بەغدا بە (فیتەی خۆپیشاندانی ئەوروپا) (هێزی کۆکرنەوە داهاتی عێراق لە بانکەکانی ئەمەریکا) بەرێوەدەچێت واتە یەك فیتە بەسە بۆ رووخاندنی ئەنقەر و هەولێر لە داهاتووی نزیکدا. ئەمە بۆچوونی لێکدانەوەی مێژووی و بەرکەوتنی کوردستانی باشوورە لە سەردەمی (چەرچل و کێسنجەر). بەردوام لە سیاسەتی ئەمەریکا دەبێت وریای تەپی پێت بیت ئەگەرنا بە چەقەنیەك لەناو دەچیت.

**نەوشێروان مستەفا نەیتوانی حکومەتی دوو حیزبی ریفۆرم بکات چونکە بەرژەوەندی ئەمەریکا لەناودەچوو بەلام دەرفەتیان پێدا بۆ ئەوەی سیستەمی سیاسی کوردستان و پەرلەمان سووك و بێنرخ بکات بەناوی بەبازارکردنی کالای سیاسی لە قیژەی دەنگی کۆمەلایەتیدا، واتە کێشەکان کۆکرانەوە خرا ئەستۆی تورفرۆش و بەندبێژ و میدیاکار لە پێگی نوێنەرایەتی گالتەجاری پرۆسەی سیاسی و هەلبژاردنی ناوەخۆی باشووری کوردستان. ئێستا دۆخی باشوور لە بۆشای گەلتەجاری هێزی ئاراستەکراوی ئەمەریکا دەخولێتەوە کەچی حکومەتی دوو حیزبی بە مەترسی رووخانی خۆیان و کەوتنی بەرژوەندی ئقلیمی دەزانن. ئەوەی لە یاری (ئەپۆکلپس) تێنەگات چارەنووسی رووخانە لە داهاتوو.**

# پێکدادانی هەولێر و بەغدا لە نێوان ئێران و تورکیا

بلۆگەر : جەودەت احمد

بابەت : داخزانی رێژەی

بەروار : 7ی جولای 2024

بلێم چ..؟ بەوێژدانەوە دەنووسم بۆهیچ کەس و لایەنێك، رۆحیەتی خۆم لەرووی ئەخلاقی ناخمە گیرفانی ئاراستەکراو، ئەوەی بەلامەوە گرینگە هۆشداری و گۆرینی ئاراستەی (عەوامی جورە) بۆ (هۆشیاری)، تاکو لە رووی نوسین و ناوەرۆکی بلاوکراوەکان وەك کەسێکی (دووڕوو) بەسەر مێژووی (بلۆگەری - ستوون نووسین)م نەچەسپێت بلێن کەسێکی میزاجی و ستوون نووسێکی رەفتاری بوو، تێگەیشتن لە پێشهاتەکان و چاوەروانی لە داهاتو و کاریگەری بەسەر ئێمەی خەلکی کوردستان چی دەبێت؟ هەمووومان لەناو ئەو کەشتیە کونکراوەی هەرێمی باشوورین بەهۆکاری ئەوەی کە حیزب دوژمنی خەلك و حکومەت و جەماوەر و رێکخستنی خۆیەتی، تەنها گرینگی بە پێگەی مانەوەی (کاریزما و مەرجەع و گۆرستان و مێژوویێکی شێواوی

خۆیەدات) بەناوی خۆهەلواسین بە پێگەی ئاین و نەتەوە و خاك لە چوارچێوەی دامەزراوەی حكومی و ئاراستەی حیزبی سیاسی، بێگەرانەوە بۆ لۆژیكی (دیموكراسی راوێژكاری). لەناوەخۆی كوردستانی باشوور.

كەواتە تا ئاستی خوێندن بەرزبێت گرینگ نیە تۆ لە چ پۆست و پێگەی، گرینگ ئەوەیە سەروەری خێزان لەناوەخۆ كۆنەپەرستی نەتەوەی و مەزهەبی لە پێگەی كلاسیكی مۆدێرن بەردەوامی هەبێت لەكۆی باشوور. ئەگەر وردبینەوە لە ڕۆمانی | دێلەگورگی خۆشەویستی و كتێب | لاپەرە 133 دەلێت (خێزانەكەی زووتر لە شیشان كۆششدەكەن تایبەتمەندی ئیسلامی شیشانیان بپارێزن و لەگەل حكومەتیش بمێنینەوە...) مەبەست لەم تایبەتمەندیە چیە كە بۆچی خێزانی كورد كۆشەش بكات خۆی بە حیزبی كلاسیك هەلبواسێت بەناوی نەتەوە و ئاین و نەبوونی جێگرەوەی نوخبەی تایبەت لەجێگای ئەمان لە حكومەتێكی تەندروستدا؟

بۆچی خەلك لەگەل ئەدای حكومەت دەمێنێتەوە كە لەدوای وەفاتی نۆشێروان مستەفا، هێزی پەرلەمانی گۆری بۆ ناسیاسی و گالتەجاری شەقام لەنێوان تورفرۆش و بەندبێژ و میدیاكار وەك جێگرەوەی رێكخستن و گەشەپێدانی حكومەتی باشوور دواتر بۆ پەككستنی پەرلەمان و نوێبوونەوەی حكومەتی هەرێم لە 2024دا؟

دەبێت میراتی ئیمپراتۆریەتی ئقلیمی وای لە خەلكی باشووركردوە كە كورد لە رۆحیەتی بێ (غیرەتی عقلی و هزری و جەستەی) بخولێتەوە نەتوانێت دەنگ هەلبرێت بلێت (نا) مەبەستی من لەم (نا)یە واتە هەبوونی هێزی شەقام، بۆگۆڕینی شەقامی خانەقین تا زاخۆ لە حكومەتی دوو حیزبی و مایكرۆجەماوەری نائۆپۆزسیۆنی بەسەرچوو. ئەزانن دۆخی داهاتوو بۆ هەرێمی كوردستان (شۆكێكی كارەسات) لەبەردەمی دایە بەهۆكاری كارنامەی گۆرانكاری ژینگەی و مرۆی و سیاسی و ئابووری كە هەولێر و بەغدا بەیەكدادەدات و دەیروخێنێت وە قۆناغی سیاسی عێراق و باشوور لەم سێ ستوونە گیری خواردووە.

1- داهاتی عێراق لە ئەمەریكایە و داهاتی هەرێم لەبەغدایە و داهاتی خەلك، مووچەیە و داهاتی باشوور، كرێ و باج و رسوماتە؟

2- ئەورووپا هۆكاری رووخانی هەولێر و بەغدایە بەرێگای جۆشدانی خەلك لە شەقام بۆرووخاندنی حكومەت و كەسایەتی مەزهەبی و نەتەوەی كە بەئاراستەی ناتۆ و ئقلیمی كارنامەی بەرژەوەندی ئەوان بەرێوەنابەن لەلایەن عێراقی فیدرال. واتە ناتۆ و ئقلیمی بینەری ئێمەن، كە ئێمە بەشەق كەسانێك لەدەسەلات بێتەخوار و جێبگرێتەوە تاكو هەژموونی ئیمپریالیزم، دووبارە بەسەرخۆمان زالبكەینەوە.

3- پەرتەوازی حیزب لەناوەخۆ و شەقام و ئاژاوەی سیاسی و ئابووری و مرۆی پەككستن و درێژكردنەوەی ئەم دۆخە بۆ جیهانی هەوالگری و ئقلیمی تاكو هەرێم لەرووی پێگەی دانیشتوانی بەیەكنەگەن و بەردەوام خەریكی كات بەرێكردن و چەلەحانێی رۆتیناتی رۆژ و كەوتنی پێگەی شارەوانی و سەروەری دادگا و جێبەجێكردن و پەرلەمان و پرۆسەی دەنگدان بن. واتە لە خالی كات بەفیرۆدان و بێ بەرهەمی ناوەخۆی بخولێینەوە.

هەموو بەیانیەك چاورێمە لەبەردەرگای مالەكەم زرێپۆشێكی (ئقلیمی و ئیمپریالیزم) لەبەردەمی مالم وەستابێت و هەردوو پەنجەی بلند بكات و قاوەیەكی بەدەستەوەبێت لەسەر تانك (دەبابە) دانیشتبێت بلێت ئێوە (بوونتان نیە) ئێمە هەركات ویستمان دەتوانین سەروەری و حكومەت و حیزب و خەلك لەژێر پۆستالی (پاژنەی ئاسنین)، پیرۆزیەكانی ئێوە لەناوبەرین. ئەزانی من واتە ئێمە، چ گۆشەیەكی شاراوەی باشوور دەبینم و دەبینین؟ رێك ئەو رۆژە دووبارە دەبێتەوە كە حیزبی سیاسی و شەقام لە بەرامبەر یەكتر

دادەنیشن (تف لە رووخساری یەکتر دەکەن و دەشیرێنن و دەڵێن خەتای تۆ بوو) ئەم دۆخە گۆرا؟ بۆچی هەرێم لە ئابووری سیاسی ڕووخا؟

ئابووری سیاسی باشوور چیە لەگەڵ عێراق؟ئەم ئابورریە تەنها لەم سێکتەرانە دەخولێتەوە کە هیچ بەهاونرخی نیە لەداهاتوو بەتەواوەتی لەناودەچێت وە لەناوچوونێکی لەسەرخۆیە...

عێراق و هەرێم لەبۆشای جیهاندا:..

1- کشتوکاڵ --- هاوردەی ئابووری جیهانگیری.

2- گەشتوگوزار ----- ووشکبوون و لەناوچوون.

3- سروشتی عێراق و هەرێم ----- بۆشای تیرۆر و جەنگ

4- نەوت و غاز ---- بێنرخ دەبێت و وزەی ناوەکی جێدەگرێتەوە.

5- کەرتی زەوی و خانووبەرە ---- چۆڵدەبێت و کۆچ دەستپێدەکات.

6- خێزان و رەگەز ---- بچووکدەبێتەوە نامێنت.

7- شوانکاری و گاوداری ---- کۆتای دێت بە گۆشتی سوور.

8- زاستی و زانکۆ ---- بۆبەکاربەری ئابووری سەرنج راکێشی دیجیتالی

نامەوێت بە شێوازی (سۆز و شەر و شاد) بنووسم چونکە نابێتە بریاری لۆژیکی من و خوێندەوەی تۆ، کەواتە بریاردان لە نووسین وەك (بلۆگەر) دوور لە (ماسکی دووڕووی) سێبەری ئاراستەکراو، دەتوانێت راستی و پێشهات و دواهاتەکان دیاری بکات بەمەرجی هەبوونی پاشاخانی بەریەککەوتنی نووسەر و دەروربەر، ئەزانی چیم بیردێتەوە کاتێك بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستانی گەورە رووخا وەك ..

شێخ محمود لە سلێمانی

مەلا مستەفا لە سۆران و بادینان

قازی محمد لە رۆژهەلات

شێخ سەعیدی پیران لە باکوور و رۆژئاوا

ئەمانە هەمووی هۆکاری ئەوەبوو کە دیموکراسی راوێژکاری لەناوەخۆی کۆمەڵگای کوردی پەیرەوی نەکراوە! بۆچی لەکۆتا کەوتنی دەسەلات بە (فیتەی دادوەرێکی ئقلیمی و جیهانی) سیاسەت و سیاسی ناوەخۆی کورد کۆتای دێت؟ ئەزانن بۆ؟ چونکە دامەزراوەی ئەم خەباتە لە دەستی ئقلیمی و جیهان بەرێوەچووە، جۆرێك بووە کە فێلی سیاسی و مێژووی لەکوردکراوە بۆ وەرگرتنی ماف و گەوجاندنی خەلك بەناوی ئۆتۆنۆمی، کەچی تا ئێستا دوو پارچەی کوردستان وەك باشوور و رۆژئاوا لەسەر مێزی هەوالگری ئازاکراوە و هیچ گەرانەوەیەکی بۆ دەنگی خاك نەبووە، کەخۆی شۆرەشی گۆرانکاری نەتەوەی لە ناوەخۆ بکات ببێتە قورسای بۆسەر جێگرکردنی سەروەری و دامەزراوەی شەرعی و دیموکراسی دوور لە دەسەلاتی سێبەر.

لە ئەدەبیاتی فارسی دەڵێت ( ئەگەر جووجەڵە لەدەرەوەی هێلکە لەدایك بوو بەفشاری دەستی مرۆڤ، ئەم جووجەڵەیە ناتوانێت شۆرەشی هێلکە و مریشك درێژبکاتەوە، بەڵکو لەدایکبوونی سروشتی جووجەڵە ناوەخۆی هێلکە بەردەوامی ئەم شۆرەش و گۆرانکارییە). کەواتە بێنرخ و بەهای کۆمەڵگای عێراق و هەرێم، لە مێژوو و رۆتینانی رۆژ و پرۆژەی کرچوکالی رێکخراوی جیهانی و حکومەت و حیزب و جەماوەری مێرنیشنی، خۆی نوێدەکاتەوە وەك دەقی ناوەرۆمانی | دێلەگورگی خۆشەویستی و کتێب | لاپەرە 133

دەقەکە دەڵێت..

خێزانەکەی زووتر لە شیشان کۆششدەکەن تایبەتمەندی ئیسلامی شیشانیان بپارێزن و لەگەڵ حکومەتیش بمێننەوە.

ئەم دەقە جوانترین بەرچاوروونی کۆمەڵگای عێراق دەخاتە پاڵ شیشانی و دووبارەبوونەوەی کلتور، هۆکارێکە بۆ دواکەوتی و سەرلێشێواوی گەلی عێراق و هەرێمی باشوورە. کەوتنی شارەوانی و دامەزراوەی سیاسی و مەدەنی و میدیای نوقەی لێوەنایەت بەهۆی (مووچە و پیشە و بەژەوەندی ژیانێکی ئاژەڵەی لە شێوەی بزندا). کۆمەڵگای کوردی تەنها خەریکی خواردنی (برنج و شلەی پەتاتەیە) کە بەکۆمەڵگای دواکەوت و نەخوێندەوار هەژماردەکرێت. هەموومان جوانین لە کەسی خۆماندا، بەلام بۆ خاك و سەروەری جۆرێکە لە (بێ غیرەتی و تاوانبارکردنی خودا) دامەزراوین.

ئێستا بەهۆی گالتەجاری مۆلیدەی ئەهلی و کەلەگای خاوەن مۆلیدە و ناچاری خەلکی کوردستان جۆرێکە لە سەرشۆری بۆ ئێمە رەخساندوە و کە دەبێت (خۆمان نەوی بکەین) و پایەندی سیاسەتی مشەخۆری و دواکەوتی هەرێم و حکومەت و حیزب و ئقلمی بین.

فەرموو تۆ بیربکەوە بۆ گۆرینی کارەبا لە داهاتووی بەردەوام....

پرۆسەی کارەبا لە داهاتوو..

1- مۆلیدەی کرێ --- بێ کوالێتی لە پێدانی کارەبا

2- مۆلیدەی پۆرتەبل ---- گرانی نرخی سوتەمەنی.

3- نرخی سوتەمەنی ---- بێ کاری و هەژاری و نەخۆشی بێ پارەی.

4- وزەی پاك لە خۆر ---- خۆلبارین و کێشەی دۆزینەوەی گۆشەی رۆژ.

5- نەوت و غاز و بەنزین ---- دابەزین نرخ و داتەپینی ئابووری.

6- وزەی نوێ (یۆرانیۆم) ----- لەلایەن ئێران و تورکیا داگیراوە.

7- ئابووری پیشەسازی ----- سەرهەڵدانی چاخی دیجیتالی

بەکورتی کۆتای پێبێنم، داگیرکردنی خاکی باشوور لە لایەن ئێران و تورکیا تەنها بردنی سامانی سروشتییە لە مادەی یۆرانیۆم و نەوت و غازە، کوردستانی باشوور لە ناو هێلی (مانگای بەپیت و نزای پ.خ نوح د.خ) هەڵکەوتووە، واتە جەنگی داهاتوو لە

جیهان بەتایبەت لە چاخی دیجیتالی بریتیە لە دۆزینەوە هایدرۆجین و یۆرانیۆم بۆ دوو پرۆژەی جیهانیە لەناوەخۆی ولاتاندا بەرێوەدەچێت.

1- پرۆژەی هایدرۆجین بۆ بەگرخستنی پیشەسازی سەوز، ئەم پرۆژەیە بەناوی کۆمەلگای (لوط) دادەمەزرێت بەناوی (هایدرۆجینی رەنگاورەنگ) هەر جۆرێك لە رەنگی هایدرۆجین بۆ بەرهەمێکی سووتەمەنی تایبەتی رۆژانە بەکاردێت. عێراق و هەرێم هەمان کێشەی (ئاو)ی هەیە بۆ بەرهەمهێنانی وزەی نایترۆجین لە دۆلی دوو رووبار.

2- پرۆژەی ناوەکی پاك ئەم پرۆژەیە لە پێکهاتەی یۆرانیۆم و هایدرۆجینی رەنگالە بەرهەم دێت بۆ گۆرینی زەوی لە کلاسیك و سووتەمەنی نەوت و غاز و بەنزین بۆ کۆمەلگای (خۆراکی پلاستیکی پرۆتین و شاری زیرەك و ستومەنی سەوز) دادەمەزرێت.

خۆراکی کلاسیك ---- خۆراکی پلاستیك و پرۆتین

گۆشتی سوور ---- بەرهەمی دەستکرد لە پرۆتین و سەوزای

ماست و شیرو سپیای ---- سۆیا و بوقولیان لە جێگای (جێل و مەڕو بزن)

نەوت غاز و بەنزین ------ هایدرۆجینی رەنگارە

وزەی خۆری سەرزەوی ----- وەرگرتنی وزەی خۆر لە بۆشای ئاسمان

کارگە و دەستی کار ------ چاخی دیجیتالی کاپیتالستی

مرۆڤ و ئاژەل ----- بچووککردنە و لەناوبردن

کۆمەلگای پەرتەوازە ----- شاری زیرەك و زیندانی دیجیتالی

حیزب کلاسیك و میراتی ----- بەکاربەری ئابووری و تاك دەسەلاتی ئالوگۆری.

ئۆتۆمبێل و کارگێری ----- رۆبۆت و کارمەندی دیجیتالی

سوپای کلاسیك و پارتیزانی ---- رۆبۆت و لەدایکبوونی منال لە تاقیگەی AI.

کتێبی ئاسمانی و ئاین ----- مەلا و قەشەی رۆبۆت

هێشتا روونتر بکەینەوە داگیرکردنی باشوور بۆبردنی سامانی سروشتیە کە تەهران و ئەنقەر و ولاتانی عەرەبی جەنگی بەدەستهێنانی چەکی ناوەکی لە وزەی پاك بۆ کارەبا و پیشەسازی و هێزی سوپای ئاسایشی خۆراك و حکومەت و خەلکی خۆیان دابین دەکەن.

فەرموو حکومەتی هەرێم و ئەحزابی کوردی بە مایکرۆجەماوەری و خەلکی کوردستان، چاوەرێ چ دەکەت بۆ داهاتووی بەردەوام کە سەرجەم نیشانەکانی ئەم پیشەسازییە سەری هەلداوە؟

بارزانی و تالەبانی و مایکرۆجەماوەری رزگارتان دەبێت لەم دۆخە؟

پرۆژەی کۆمەنیستی نوێ چ هەلوێستی دەبێت بۆ هەرێم، کەنەتوانێت خۆی رزگاربکات لە دەستی ئقلیمی چۆن داوای بوژانەوە دەکات؟

پرۆژەی ئیبراهیم بۆ ئاشتی و جەنگ چۆن هاوکاردەبێت بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی کارتۆنی کوردی لە پەیمانامەی (بزوتنەوەی شۆرەشی کوردی باشوور) پێیدراوە؟

ئەوە کوردستان رۆیشت و کەوتە بەر پرۆژەی دزین و داگیرکردنی سامانی سروشتی و لێستاندنەوەی شەرعەیەتی خاك و خەلك و حکومەت لە چوارچێوەی شەکەستی سیاسەتی کوردستانی باکوور و رۆژهەلات و رۆژئاوا و باشووردا.

شەرعەیەتی باشوور تەوابووە لە ناوەرۆك تەنها لە رووکاری ماوە و ریفۆرم (ریتێراتۆری) بکات لە سنووری ئێران و تورکیا و عێراق و سوریا؟

ئەم (نوێبونەوە واتە ریفۆرمکردنە) وێنەکانی کاك(مەسعود و مام جەلال و ئاپۆ و قازی) چارەنووسی باشوور و کەوتنی کوردستانی گەورە رزگاردەکات؟

جیهانی دیجتالی، بە بێ غیرەتی و ووشەی تاوانبارکردنی خودا بەرێوەناچێت کە دەلێن (خودا گەورەیە) ئاخر خودا عقلی بە ئادم دا تاکو فێری ژیاربێت لەسەر زەوی، بۆدەبێت بێ (غیرەتی کورد و خێزان و حیزب و حکومەت و میدیا) لە ووشەی تاوانبارکردنی (خودا) کۆتای بێت؟ کە نەتوانێت خۆی رزگاربکات و داهاتووی دیاری بکات؟

کەواتە کۆتا گۆرانکاری جیهانی بەسەر هەرێم زالدەبێت لەناوی دەبات وە بەغدا و هەولێر بەیەکدادەدات...

کۆتا گەشەی جیهان..

1- گۆرینی وزەی سوتەمەنی بۆ یۆرانیۆم.

2- پەخشکردنی داتای تەکنەلۆژی ئەورووپا بۆ بۆشای ئاسمان.

3- زیرەکی خۆرێیەری بۆ 2030 قازانجی 81 ملیار دۆلارە.

4- مایکرۆسۆفت سیستەمی کارەبای گۆری بۆ وزەی ناوەکی.

5- کۆمەلگای (لوط) لە AI بەناوەرۆکی رەنگاو رەنگ لەداخزانە.

6- گۆرینی نەوتی خاو بۆ مادەی سەرەتای لە بەرهەمهێنانی 3dدا.

7- گۆرینی وزەی تەکنەلۆژیا بۆ وزەی خۆر لە ئاسمان جێگری دەکرێت.

8- بەرهەمی نایترۆجین لە جێگرەوەی نەوت و غاز و بەنزین.

9- خۆلبارین و تاریککردنی زەوی بۆ دابەزاندنی پلەی گەرم زەوی.

تاریکبوونی زەوی و داتەپینی ئابووری و پیشەسازی هەرێم چی بەسەردێت کەچی هەرێم ئابووری و پیشەسازی هەیە تاکو خۆی لەم قەیرانە و پێشهاتە جەنگیانە رزگاربکات؟ یان چاوەرێ فەرنسایە کە بەرێگای مێژووی دبلۆماسی پێدانی (دووحەبی ژانەسەر لە خەباتی شاخ) هەرێمی باشوور رزگاربکات؟

ئەوەی دەبینم، خەڵك كۆچ دەكات دەبێتە جەنگی كۆجبەران و ولاتانی خۆشگوزەران سەرباری ئاژاوەی سەرهەڵدانی جەنگی ناوەخۆی لە عێراق و هەرێمدا....

دیارنیە چ ئاراستەیەك پشتگیری ئەم پرۆژەیە دەكات كە

(هەرێمی كوردستانی باشوور، شاپێكی پێدەكەوێت سەری خەڵك و بارزانی و تاڵەبانی و ئۆپۆزسیۆنی دەخوات).

# شۆڕەشی ستوون نووسینی ژمارەی لە باشوور

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : شۆڕەشی نووسین
بەروار : 8ی جولای 2024

نووسینی ئەم بابەتە بەترسەوە دەنووسم چونكە رۆڵی بلۆگەر لەناوەخۆی كوردستان و عێراق لەژێر هەڕەشەی كوشتن و تۆقاندن و چاودێری و زیندانی دەرەكی یەوە واتە، جۆرێك لە زیندانی ناوەخۆی لەناو ماڵ بۆت دەرەخسێنن كە نەتوانی گەشتی ناوەخۆی كوردستان و دەرەوەی سنووری شارەكەت بكەیت بەهۆی، چاودێری ژمارەی تەلەفۆن و چاودێریكردنی تۆماری دەنگی و گەڕان بەناوی نووسەر و بلۆگەر، بەرێگای تاوەری تەلەفۆن و خاڵی دۆزینەوەی مەودای ژمارەی ئەم تەلەفۆن بەئاسانی خاڵی مانەوە و نووستن و كات بەسەربردنی ئەم بلۆگەر و نووسەرە دەدۆزرێتەوە. بۆیە مانەوە لە شوێنی خۆت و بەردەوامیدانی لە شۆڕەشی نووسین و هێزی مەعریفەی جەنگی (عقل) بەرامبەر بە هێزی دیجیتاڵی و سیاسی و سەربازی و ئابووری و مرۆی، وادەكات رۆڵێكی بەرچاو بگێریت لە هۆشیاری ناوەخۆی و كاریگەری دەرەكی بەسەر پێشهات و دواهاتەكانی باشووری كوردستان.

دەمێكە دەڵێم هێزی قەڵەم (پێنووس) هێزێكی فیزیكی و ئاراستەكراوە بەرێگای ڕەوانبێژی و پرۆسەی دیموكراسی راوێژكاری، واتە كاتێك من واتە ئێمە دەنووسین، ناوەرۆكی نووسین بۆ ئاراستەی ریفۆرمی جوگرافیای سیاسییە، سەرباری هۆشیاری خەڵكی باشوورە بەمەرجێك لە عقلێكی پەتی و تەندروست ئەم بەرهەمە نووسراوە لەدایكبێت و بەناو كۆدی دیواری جیهانی دیجیتاڵی ببرێت نەتوانێت هیچ پێشگری و بەرگری بەرگەی بگرێت. خەباتی دیموكراسی ڕاوێژكاری هەموو نووسەرێك ناتوانێت ئەنجامی بدات چونكە لە ژیاری نووسەر و بلۆگەر، تەنها قەڵەمی دیجیتاڵی ماڵی پەڕی كۆمەڵایەتی هەیە كە لە هەوێنی خاكی باشوور لەدایكبووە بۆیە بە هزری ئازادی دیموكراسی راوێژكاری لە هێلی پێشەوە یاری بەمەرگی خۆی دەكات بۆ گەیشتن بە خاڵی كۆتای ریفۆرمكردنی (خاك و نان و ئاشتی) لە جوگرافیای خاڵی خۆلەمێشی ئاژاوەی سیاسی و دۆلار و پرۆكسی و كۆمەنیستی نوێ واتە برێكس و نیولیبرالی ج7. ئەم یاریكردنە بەمەرگی خۆمان لەپێناو گەشەپێدانی دیموكراسی راوێژكاری و بەكلتوركردنی نووسینە لە هێزی سوپای تاك و دیبلۆماسی دیجیتاڵی بەردەوام چاوەری چاكبوون و مەرگێكی كپ و شاراوە دەكەین كە هێزی نووسین ببێتە هۆكاری گۆرینی كۆنەپەرستی كلتوری كوردستانی باشوور بۆ ئازادی تاك و زانست و كۆمەڵگای خۆبەخشی.

بۆیە واپێویستە بۆئاوادانی عقلی حیزبی كلاسیك و دەوڵەتی نەتەوەپەرستی و كاپیتالیستی، دەبێت بەردەوام ئێمەی بلۆگەر لە رۆژهەڵاتی ناوەراست، دەبێت پەیرەوی دبلۆماسی لە نووسینی بێلایەن و برینی ژوورە تاریكەكان كەلە زمانی خەڵك و تێگەیشتن لە بلاوكراوەكانی ناوەرۆكی دیجیتاڵی بەرێگای لێكدانەوە و شیكردنەوە و هێنانی بۆسەر شانۆی رووداوەكان لە دیواری دیجیتاڵی جوانی بە كلتور كوردی و هێزێك لە نووسین بخینە پاڵ ئەم نووسینە تاكو ئاستی هۆشیار و بێلایەنی خۆمان دەرببڕین.

تا ئێستا بە ئازادی ناتوانین باسی ئاژاوەی سیاسی و دۆلار و جەنگی پرۆكسی لە پێگەی ناتۆ و ئەمەریكا لەناوەخۆی كوردستان باسبكەم و باسبكەین، واتە سەرباری كێشەی دەوڵەت نەتەوەی لەهاوسنووری كوردستانی باكوور و دەوڵەت مەزهەبی لە كوردستانی رۆژهەڵات و دەوڵەت ئشتراكی لە نیشتیمانی عەرەبی. كۆمەڵگای نووسەرانی سەربەخۆ لە بازاری دیجیتاڵی بۆ ئێمە زۆرئاسان نیە بە ئازادی خۆمان لە عقلی پەتی بلاوكراوەكان پەخشی دیجیتاڵی بكەین. وێنەی ئەم زیندانە لە بازاری سیاسی دیموكراسی (خاوەنی ویكلیكس) بوو.

**ئازادی** : واتە هەولدانە بۆ رزگاربوون لە سیستەم و گۆرینی هێزی حكومەت و دەسەلات لە یەكگرتنی پەرتەوازی و داواكردنی مافی ئۆتۆنۆمی تاك یان نەتەوە لە چوارچێوەی (خاك و زمان و ئاین) دەگرێتەوە كە بەهۆكاری فێلی سیاسی و جوگرافیای ئابووری ئەم مافە ئۆتۆنۆمیە جێبەجێدەكریت و دەبێتە جەنگی پارتیزان و شۆرەشی شەقام لە سێبەری ئیمپریالیزمدا.

**جەنگی پارتیزانی** : شۆرەشێكی دۆلار دیبلۆماسی لە نێوان پێكهاتەی نەتەوەی و دەسەلاتی مەزهەبی و تاك دیكتاتۆری و دیموكراسی رژێمی بەرێوەدەچێت لێرە پێكهاتەی نەتەوەی ئەم جوگرافیایە دەگۆرێت بۆ خالی خۆلەمێشی و ئازادكردنی لەم دەسەلات بەقوربانیدانی جینۆساید و ئەنفال و راگواستن بۆ ئەوەی تاوانی ئەم هێزە كە مافی پێكهاتە نادات ببێتە تاوانی دیبۆمای و دیواری جەنگ لە جیهانی هەوالگری زلهێزان وەك خالی گۆرانكاری ریشەی و رووخانی ئەم دەسەلاتەیە. كەواتە ئازادی نەتەوەی روونبۆوە بۆ ئێمەی كورد لە شۆرەشی (بەردەقانی) بۆ دۆلار دیبلۆماسی.

**ئازادی شۆرەشی شەقام** : ئەم جۆرە شۆرەشە بەرێگای ناوەندی هەوالگری ئەقلیمی و جیهانی بەرێوەدەچێت لە گۆشەی دژە ئاین و ئایدۆلۆژی و نەتەوەی بۆ ئازادی نوینەرایەتی و دامەزراندنی دەولەتی و هەرێمی لەرزۆك لە سێبەری دەولەتی قول، وەك شۆرەشی بەهاری عەرەبی كە دژ بە جەمسەری مەزهەبی سوونە و شیعە لەناوەخۆی رۆژهەلاتی ناوەراست تەكانی بەگۆرانكاری مێژووی سیاسەتی كلاسیكی سەدەی 20 گۆری بۆ جەماوەریە بەرێوەچوو. كەواتە شۆرەشی بلۆگەری دیجیتالی بەشێك بوو لە دیموكراتیزەكردنی دیبلۆماسی دەرەكی لە پرۆسەی دیموكراسی راوێژكاری، واتە بلۆگەرەكان پردی شیكردنەوەی ناوەخۆی بەجیهانی دەرەكیان گەیاند لە گۆشەی جیهانی رۆشنبیری لە شەقامەوە ئاراستەی دەنگی ئازاد بۆ ئازادكردنی بەهاری عەرەبی پشتگیریكران و شۆرەشی بلۆگەرانی دیجیتالی سەركەوت بەلام بوونە قوربانی ئەم خەباتە لە نووسین و بلاوكراوەكانیان كە بووە هەوێنی مێژووی كلتوری نوێ لە رۆژهەلاتی ناوەراست و ولاتانی ئیسلامی و پێكهاتەی نەتەوەی و مەزهەبی.

**ئازادیخوازی چی یە** : پرۆسەی ناوەراستی گۆرینی دەسەلات و وەرگرتنی مافی ئۆتۆنۆمی نەتەوە و ئاین و خاك و نیشتیمان لەچوارچێوەی هەولدانێكی جەنگی پارتیزانی (خەباتی بەردەقانی) واتە شۆرەشی چەكداری لە پرۆلیتاریای كلتوری نەریتی پەتی ئەم ناوچەیە لەدوای كۆتای هاتنی سەدەی 20 و سەردەمی سەرەتای چاخی دیجیتالی جۆرێك لە شۆرەشی شەقام بەرپابوو كە وێنەی ئەم شۆرەشە، بەهاری عەربی لە نیوان جەنگی مەزهەبی و گۆرینی دەسەلاتی رژێمی بۆ دیموكراسی نوێنەرایەتی. تەواو بۆمان روون بۆتەوە كە پرۆسەی ئازادیخوازی پێویستی ریفۆرمكردنی ناوەخۆی دەسەلاتی میراتی ئەم ناوچەیە و حكومەت و كلتورە ببێتە رۆحیەتی هزری رۆشنفكران لەسەر ئاراستەكراوی ئازادیخوازی تاك و گروپ و بال و عەوام جۆرێكە لە نوێبوونەوەی لەسەرخۆ بۆ ئازادیخوازی (زانستی و هزری و خۆبەخشی) لە بەرهەمێهنانی شۆرەشی بلۆگەری دیجیتالی بۆ شۆرەشی پیشەسازی و داهینان لەناوەخۆی بەهەرمێهانی ئابووری مرۆی ریفۆرمكردنی سێكتەری دامەزراوەی گشتی حكومەت و ئاراستەكراوی سیاسی حیزبی و مایكرۆجەماوەریدا.

**دیموكراسی راوێژكاری** بریتەی لە نوخبەی رۆشنفكران وەك ئالوگۆری دیبلۆماسی دیجیتالی تاك لە پێگەی چاخی شۆرەشی پیشەسازی دیجیتالی و كلتوری تاكو نوێبوونە لە یاسای (ئازادی +ئازادیخواز = دیموكراسی راوێژكاری) هەنگاوی ئێمە لێرانە گشتاندنی هزرە بەسەر عەوام بۆئەوەی هۆشیاربێت كە لەپرۆسەی سیاسی چۆن بێگەرانەوە بۆنالۆژیكی بریار بەگوێرەی (سۆز و شەر و شاد) نەبێتە قوربانی دەنگی بەتال لە بەشداریكردنی پرۆسەی دەنگدان و دامەزراندنی ناشەرعی پەرلەمان و حكومەت، چونكە دەنگی ستراتیژی رووی راستەقینەی دامەزراوەی شەرعی حكومەت و حیزب و هەرێمە نەوەك دەنگی (عەوام بەرێگای نەیارشەیدای) بێگەرانەوە لە تێگەیشتنی خواستی ژیانی داهاتوو و گۆرینی بۆ ئازادی هەولاتیبوونی پەرلەمان و سەروەری حكومەت و دامەزراویەكان، دەبێت خۆی بەدوور بگرێت لە ئەدای سیاسی (كاریزمای و نەریتی و مەرجەعی) بەلكو شۆرەشێكبێت لە نوێكردنەوەی شەقام و سیاسەتی ناوەخۆ و كاریگەری بەسەر دەرەوەهەبێت بۆیە ئازادی واتە ئەوەنیە كەتۆ خاوەن مووچە و پێگە و كەسی خۆتبیت لە حیزب و ناوچەكدا بەلكو سەروەری تۆ لە دەنگ هاوبەشە واتە گۆرینی دەسەلات و حكومەت و حیزب هیچ لەتۆ ناگۆرێت بەلكو داهاتووی تۆ فراوانتر دەكات پێگەی تۆ جێگردەبێت لە ژیانی ئاسای خۆت. كەواتە ئازادی نووسەرێكی دیجیتالی و دەنگی ستراتیژی كە دۆخی ناوەخۆی چەقەبستووی هەرێم ریفۆرم بۆ كراوەی بەردەوام پێگەی عەوام بەشێكە لە دەنگی ئازادی گشتیدا.

ئازادی و ئازادیخوازی و دیموكراسی راوێژكاری دەبێتە ئامراز و ئامانجی دامەزراوی جەماوەری و دیموكراسی لە هۆشیاری پێشهات و دواهات و وەبەرهێنانی ئابووری مرۆی و هزری و زانستی و خۆبەخشی زانكۆكاندا. بۆیە جیهانی ئەقلیمی و زلهێزی بەوەردی كار لەسەر تۆری كۆمەلایەتی وەك فەیسبووك و ئێكس و یوتویوب و سەرجەم پلاتفۆرمە دیجیتالیەكان بۆ ئەوەی بەكەمترین تێچوو زۆرترین زانیاری هەوالگری كۆمەلایەتی كۆبكەنەوە دووبارە بەسەر ئێمە بچەسپێن و سەركوتمان بكەن بەناوی ئاژاوەی سیاسی و تێكدانی بەرژەوەندی جوگرافی.

جیهانی هەوالگری بە یەك مۆبایل و دوو كۆمپیوتەر و هێلی ئەنتەرنێت بەرێوەدەچێت كە لەیەك ژوور لەكەمترین ماوە دەستی بەهەموو جیهان بگات، ئەگەر تێچووی مانگانەت هەبێت لە پەیوەندی بازاری نیولیبرالی دیموكراسی بۆشای ئاسمان ئەوكات وەك بلۆگەر و میدیاكار و رۆژنامەوان و هەوالگری دیجیتالی زۆرترین زانیاری پشتراست دەكەیتەوە كە بوونت لەپێگەی هێزی حكومەت و سوپا و دەولەت بەرزتردەبێت بەلام ئەوكات یاری بەمەرگ و نیشتیمان و خاك و نەتەوەی دەكەی بۆیە جیهانی شۆرەشی بلۆگەری دیجیتالی هیچی كەمتر نیە لە شرۆڤەی میدیای و هەوالگری و سیاسی و ئابووری و جەنگ.

ئەوەی ئێستا روودەدات هیچ پەیوەندی بە نووسەرانی دیجیتالی نیە بەلكو بەمادەی 19 لە نەتەوەیەكگرتووەكان هەموو كەسێك بۆیی هەیە دەستی بەزانیاری بگات و شیكردنەو بلاوكراوەكان پەخش بكات بێ ئەوەی ئەو بلۆگەرە و نووسەر و رۆژنامەوانە بەشێك بێت لە رووداوەكان، بەلكو هۆشیاری و ژیری بلۆگەر، لێكدان تێكهەلكێشكردنی رووداوەكانە كە دوور لە پەیوەندی و بەشداربووی رووداوەكان، شرۆڤەی خۆی دەكات و خەلك و حكومەت و حیزب و دامەزراوەی مەدەنی هۆشیار دەكاتەوە لە چوارچێوەی پرۆژەی دیموكراسی راوێژكاری. بەلام لە كوردستانی باشوور بلۆگەری ترسناكترین كارە بۆ بەردەوامیدانی شۆرەشی نووسین لە چاخی دیجیتالیدایە.

**هەركات ستوونێك بنووسم سەرتا دەبێت (گۆرێك و كفنێك و ماتەمینیەك و تیرۆركردن)ی لەناكاوم داناوە لەدوای بلاوكردنەوەی نووسینەكان لە كاتژمێری یەكەم تا كۆتای هاتنی سالی نوێ لەناوەخۆی دێهات و شارو كوردستانی باشووردا. ئەزانن بۆ ؟ (چونكە هەولێر ناوەندی هەوالگری زلهێزی و ئەقلیمی جیهانیە لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا).**

**بلۆگەر واتە ئازادی و ئازادیخوازی و دیموكراسی راوێژكاری = بە وەبەرهێنانی ئابووری مرۆی و زانست و هزر و تاقیگەی خۆبەخشانی زانكۆكانە لەدەرەوەی فەرمی و نافەرمی و شەقامی باشووردایە.**

بۆئەوەی بلۆگەرێكی بەهێزبیت، دەبێت خوێنەرێكی 15 سالەی بواری جیاوازت هەبێت سەرباری پەیوەندی دیبلمۆماسی دیجیتالی تاك لە كۆمەلگای ناوەخۆ كە گەیشتن بەناوەرۆكی بلاوكراوەكانی خەلك ومیدیا و حكومەت و حیزب دەبێتە مێژووی هەلسانەوەی شۆرەشی بلۆگەری دیجیتالی كوردی لە باشووری كوردستاندا. بلۆگەر واتە شۆرەشی شكاندنی دیواری رەق بەرێگای شۆرەشی دیجیتالی و مردنێكی لەسەرخۆ و لەناكاو لەبەردەمت دایە بەلام پاشاخانی نووسراوەكان دەبێتە هەوێنی گۆرینی كۆمەلگای كوردی.

**بلۆگەر وەك ئەدای ئۆپۆزسیۆنە ئەوەنیە شەربەت خۆشبكات بۆ دەسەلات بەلكو دۆزینەوەی بۆشای دەسەلات و هۆشداری و بردنەوەیە لە دەنگدان و چەسپاندی دیموكراسی و ئالوگۆری دەسەلاتە لە هێشتنەوە خاك و نان و ئاشتیدا.**

# دهۆك له ناوچەی خۆلەمێشی... (ئەگەر و بۆچوون)

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : تیۆری سیاسی
بەروار : 9ی جولای 2024

باسای پێشهات و دواهات له باشووری کوردستان بەتایبەت له سنووری خاکی دهۆك وەك خالی گالتەجاری جەنگی ناتۆ و برێکس لەسەر لەناوبردنی پەکەکە و هەلسانەوەی پارتی و دۆراندنی یەکێتی له کوردستان و کەرکوك بەرێوەدەچێت واته خالی گالتەجاری جەنگی پرۆکسی بۆ دوور کەوتنەوە له ناوەخی زلهێزی دوو جەمسەری واشنتۆن و مۆسکۆ، هەولێر ئامادەیه هەموو مالێکی کورد بکاته خالی جەنگ بۆمانەوەی حکومەت و حیزبی و کۆمپانیا بەم جۆره جەنگه دەلێن (هەرێمکی گالتەجار له دیواری بلاوکراوەی میدیای ناوخۆی و جیهانیدا).

🔴 ئەگەری یەکەم...

ئەگەر ئەمەریکا ئۆکەی کرد بۆ تورکیا بەمەرجی پاراستنی خەلك و دێهات لەم جەنگه ئەوا براوەی پشتگیری ئۆپۆزسیۆنی ئقلیمی له دلسۆزی ناتۆ و پێگەی سوونه بەرزدەبێتەوه دژ به شیعەو بالی برێکس له سنووری ئێران و عێراقدا.

🔴 ئەگەری دووەم...

ئەگەر پارتی بەرێگای ئەنقەر سوپای هێنا بۆناوەخۆی بادینان ئەوا گۆلێکی سیاسی و سەربازی له یەکێتی و مایکرۆجەماوەری باشوور دەکات سەرباری پشتگیری سوونەی عێراقی (عۆجه) لەبالی عوسمانی مۆدرێنی سوونه نشین.

🔴 ئەگەری سێیەم...

ئەگەر یەکێتی دۆرا لەم جەنگ دەبێت بەهاوکاری تەهران و مۆسکۆ جەنگی تیرۆر بەرپابکات دژ به سنووری جیۆسیاسی برێکس لەناوەخۆی شەری قەندیل که بەگوێری سپی میدیا زیاتر له 400 کۆنه تیرۆر له تەمەنی 13 سالی تا 60 سالی بەهاوکاری سووپا داخزاینه ناوەخۆی سنووری بادینان، مۆسکۆ هەلوێستی جدی دەبێت بۆ ئەم جەنگه بەلام پارتی و بارزانی چۆن خۆیان رزگاردەکەن لەم ناوبره ئقلیمی و جیهانیه.

🔴 ئەگەری چوارەم...

ئەگەر جەنگی پەکەکه و تیرۆر لەقەندیل بەرپابوو و کاریگەری بەسەر جیۆسیاسی برێکس هێنا که زیاتر له 4 پرۆژەی مێگا بازرگانی له سنووری کوردستانی باشوور و ناوەخۆی عێراق دادەمەزرێت، ئەوکات هەلوێستی صین و رووسیا و هند دژبه تورکیا و عێراق چ دەبێت؟

🔴 ئەگەری پێنجەم...

ئەگەر بارزانی وەك ریفراندۆم بێگەرانەوه بۆ وانشتۆن وەك سعودیا بەرێگای جەنگی تیرۆر لۆبی کردەبێت که چۆن کەرکوکی لەدەستدا ئەم جاره چۆن بارزانی و پێگەی پارتی له پرۆژەی ئیبراهیم بۆئاشتی و جەنگ رزگاری دەبێت، ئایا شەری تورکیا دەکات؟ یان پەکەکه بەرێگای ئێران و سلێمانی زیندودەکاتەوه بۆ رووخاندنی پشتێنەی ئاسایشی ئەنقەره بۆ هاتنه پێشی پرۆژەی زایۆنیزمی نوێ بەناوی ئاشتی و جەنگ؟

🔴 ئەگەری شەشەم...

ئەگەر پارتی بینەری جەنگ بوو لەم ناوە، وە یەکێتی شەری سێبەر و لۆجستی و شەقام و میدیای بەرپاکرد، ئایا ئێران پشتگیری یەکێتی دەکات لە پێگەی شیعەی پرۆئێرانی لەناوەخۆی عێراقدا؟ بۆبردنەوەی هەڵبژاردن و جێگردنی دەسەلاتی لەکەرکوك و موصل دژ بە تورکیا و پارتی؟

🔴 ئەگەری حەوتەم...

ئەگەر پارتی و بارزانی بەرێگای لۆبی لەواشنتۆن دادگای عێراقیان هەڵوەشاندەوە بۆ هاتنی سوپای تورکیا بۆناوەخۆی موصل و کەرکوك و نزیك سنووری سلێمانی و لەناوبردنی هەژموونی ئێران و یەکێتی لەعێراق، ئایا رۆلی ئێران و عێراقی نوێ چ دەبێت بۆ راگرتنی سەروەری عێراق بە هێزی فشاری شاراوەی ئێران و یەکێتی؟

🔴 ئەگەری هەشتەم...

ئەگەر سنووری قەندیل بووە جەنگی تیرۆر لەنێوان خەلك و پەکەکە و تورکیا کەبووە مەترسی بۆسەر تەهران، ئایا سوپای پرۆکسی ئێران جەنگ دەکات بۆ پاراستنی دەسەلات و سەروەری خۆی یان بەردەوامی بە پەکەکە و یەکێتی دەدات لەم جەنگە تاکو سنووری هێزی جەنگی غەززە بپارێزێت، لەم کاتە حزبولای عێراقی رۆل دەگێرت وەك 2014؟

🔴 ئەگەری نۆیەم...

ناوچەی بادینان لە پێکهاتەی عەشیرەتی گەورە دامەزراوە زۆربەیان لە مێژووی بادینان ناخۆشی و جەنگ و میراتی دژ بەناوچەی بارزان و دۆلی شاندەر هەبوو، پرسیارەکە ئەوەیە ئەگەر سوپای تورکیا بۆ کۆنترۆلکردنی بارزانی و پارتی، ئەم عەشرەتانە چەکدار و مووچەخۆر بکات و دژ بەوکاتەی کە ئەنقەرە دەکەوێتە بۆشای سیاسی  BRICS و G7 کە هۆکاری جەنگی رووخانی جەمسەری کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال دیموکراسیە واتە هاتنی پرۆژەی ئیبراهیم بۆ سنووری یەکێتی سۆڤیەت چۆن تورکیا خۆی لەم جەنگە دەپارێزێت کە بارزانی پێشرەوی قۆستنەوەی دۆخەکەیە، ئایا عەشیرەتی بادینیان بە هێزی لۆجستی و پارەدارکردنی دژی پارتی و بارزانی شەر دەکەن بۆ تۆلەی سیاسی؟

🔴 ئەگەری دەیەم...

ئەگەر غەززەی نوێ لە 2030 بووە هۆکاری رووخانی کەندوای عەربی لە پیگەی ئابووری بازاری هاوردە لە دەریا، ئایا شاری بریقەدار پشتگیری بریکس دەکات بۆ هەلسانەوەی ولاتانی کەنداوی عەربی؟ ئێستا سعودیا بەفەرمی کۆتای بە گرێبەستی پاراستنی ئاسایشی خۆی داوە لەگەل ئەمەریکا، وە کێشەی دۆلار و نەوت و پێگەی زلهێزی ئەمەریکا لەم ولاتە لەقبووە، ئایا سعودیا دەبێتە رێبەری شیعەی ئێرانی بۆ جەنگی تیرۆر لە رێرەوی قەندیل و رۆژهەلاتی ناوەراست؟

🔴 ئەگەری یازدە...

ئەگەر بارزانی بینەری ئەم جەنگەبوو وە ئەنقەرە بەفشاری سەربازی ناوچەی خۆلەمێشی بادینان ئاوەدانکردوە لە کەرتی تەندروستی و خوێندەن و کار و رێگاوبان و کشتوکالی، ئەوکات خەلکی بادینان بەتایبەت عەشیرەتەکان ئاراستەی دەنگی سیاسی لەناوەخۆ ناگۆرێت بۆ نەخۆشی (نەیارشەیدای) واتە دژی تورکیا و بارزانی دەنگ بە ئۆپۆزسیۆن و یەکێتی بدات بۆ تۆلەی سیاسی و عەشائیری و ناوچەگەری؟

🔴 ئەگەری دوازدە....

ئەگەر برێکس ئابووری ئەنقەرە لاواز بکات بەرێگای رووسیا، ئایا ئەمەریکا لە هەڵبژاردنی کۆتای ئەمجارەی تورکیا دەسەلاتی دەخاتە دەست ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسی؟ ئەگەر ئەمە روویدا، ئاکەپە چ هەڵوێستی دەبێت وەك حیزب لە سیاسەتی مانەوەی لەناوەخۆی تورکیادا؟ دەتوانێت بەرێگای بەشار ئەسەد دۆخی ئاسایشی ئەمەریکا لە کوردستانی رۆژاوا بشەڵقێنت و پەکی بخات؟

🔴 ئەگەری سێزدە...

مایکرۆجەماوەری و حیزبە کوردیەکان لەدوای ئەم هەڵبژاردنە، بەبردنەوە و دۆرانی ئاکەپا و ئەردۆغان، دەتوانن بەفشاری ئەمەریکا ئاراستەی سیاسی ناوەخۆی تورکیا بشەڵقێنن بەرێگای خۆپیشاندان و هەڵسانەوەی پەکەکە بۆ لێدان لە بنکە و بارەگای سوپا لە دەرەوەی تورکیا وەك عێراق و سوریا و لیبیا و قەتەر بەرێگای تۆلەی دژە مەزهەبی سوونی لەرۆژهەلاتی ناوەراست.

🔴 ئەگەری چواردە...

ئەگەر ئەنقەرە هەڵبژاردنی ئەمجارەی هەرێمی باشووری دواخست بەفشاری سەرهەڵدانی جەنگ و تێوەگلانی پارتی و دورستکردنی دژەجەمسەری لەناوەخۆی کوردستان، ئایا عێراق هەڵوێستی چی دەبێت بۆ بریاری دادگای و سیاسی و سەربازی؟ چونکە هەڵبژاردنی عێراق لە 2025 نزیکدەبێتەوە کاریگەی ناوەخۆی و نێودەولەتی بەدوای دادێت.

🔴 ئەگەری پازدە...

هەولێر و دهۆك خرا سەر تورکیا بەرێگای داگیرکردن و نوێکردنەوە لە داگیرکاری، ئایا بەغدا و واشنتۆن و تەهران و مۆسکۆ هەڵوێستی چیان دەبێت بۆ دابرانی عێراق لە پێگەی بارزانی و ئۆتۆنۆمی لە سێبەری فیدرالیدا؟ ئەگەر ئەمەریکا لەدوای گۆرانکرای سیاسی ناوەخۆی و دەرەکی کە توانیا پۆتین لە دەسەلات بمێنێتەوە ئایا تورکیا لە دەروەی ناتۆ رادەگیرێت و دەردەکرێت؟ ئەگەر دەرکرا ئەوکات ئابووری تورکیا لەگەڵ ئەرووپا و رووسیا چی بەسەر دێت؟ هەڵوێستی بارزانی چ دەبێت بۆ دۆراندنی دووەم لە پێگەی هەولێر و دهۆك؟ وەك کەرکوك لەرابردوودا؟

🔴 ئەگەری شازدە....

ئەگەر سوپا بەرێگای بازنەی ئارامی توانی وەبەرهێنانی سامانی سروشتی بکات لەناوەخۆی سنووری دهۆك و هەولێر ئەوکات بەغدا بەرێگای دەستوور چ هەڵوێستی دەبێت لە دادگای و یوئێن و چینوتوێژانی سیاسی و ئابوری و سەربازیدا؟

🔴 ئەگەری حەڤدە...

ئەگەر صەفارەتی ئەمەریکا وەك لیبیا لەپێگەی جەنگی پرۆکسی کراقوربانی بۆ پێشخستن و بچووکردنەوەی سنووری برێکس لە پشتێنەی تورکیا و ئێران، ئایا تورکیا دژی رووخانی ولاتەکەی دەچێتە پال برێکس؟ ئایا برێکس پشتگری تورکیا دەکات بۆ هەڵسانەوە لەم دۆخە؟

🔴 ئەگەری هەژدە..

لە سالی 1992 کاتێك بارزانی سەردانی ئەنقەریکرد بۆ بەهاناوەچوونی تورکیا لە قەیرانی ئابووری و بوژانەوەی ژێرخانی ئابووری کریێ لە هەرێم، ئەگەر تورکیا پاشەکەشەی کۆمپانیا و بانك و بلۆکرکردنی سامانی خێزانی بارزانی و حیزب لەناوەخۆی تورکیا هەڵپەسێردرا؟ ئایا پێگەی پارتی دەتوانێت سوپای پێشمەرگە و خەلکی خۆبەخش بخاتە هاوشانی سوپای تورکیا بۆ جەنگی ناوەخۆی پەکەکە و یەکێتی و جەمسەری برێکش و ج7؟

**ئەمانە هەمووی ئەگەرەن کە لە یاری تیۆری سیاسی لە پێشهات و دواهات روودەدات بەلام کێ بەرپرسە لەم یارییە بۆ پاراستنی**

**چارەنووسی خاك و خەڵكی كوردستان؟ وەك بلۆگەر هیچ بەرپرسنیمە لە پێشهاتەكان ئەوەی وەك ئەركی ئەخلاقی خۆم لە پێگەی بلۆگەری بە پێویستم زانی دیموكراسی راوێژكاری بخەمە ئەم گۆشەیە بۆ هۆشداری ناوەخۆی و دەرەكی.**

# شۆڕەشی نەفتخۆران

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : درۆی سیاسی
بەروار : 12 ی جولای 2024

**ئەگەر بیركردنەوەت تەسكە، تكایە مەخوێنەوە...**

دەمێكە بیر لە خەباتی باشووری كوردستانی عێراق دەكەمەوە بۆ ئەوەی بەلێكدانەوە رابردوو لەگەل داهاتووی كە بەركەوتنی ئێمە و دەورووبەر جۆرێكە لە پێشهات و دواهاتی ناوەخۆی كوردستان و گۆرانكاری رۆژهەلاتی ناوەراستی نوێ وەك یاری نێوان سەگ و خاوەنەكەی وایە كە بەفرێدانی ئێسك، بەردەوام یاری بەسەگ دەكات بۆ گەمژاندنی لە رێگای گۆرینی رەفتار و دلسۆزی ئاژەلی بۆ مرۆڤ دۆستی، واتە **ئەم یارییە لە نێوان سەگ و خاوەنەكی هەمان لۆژیكی نێوان خەلكی كوردستان و دەسەلاتە** لە چوارچێوەی رووداوەكانی خۆرهەلاتی ناوەراستدایە. زۆرجار بیر لە باوكم دەكەمەوە كە لە تەمەنی 16ی وەك پێشمەرگەی هەرزەكار خەباتی كرد بۆ (دەنگی خاك) بەدلێكی گەرم و رۆحیەتی نەتەوایەتی لە چوارچێوەی شۆرەشی كلتوری (**خەباتی بەردەقانی**) كە تەنها كلتور پێناسەی كردووە بەناوی جوتیاری و شوانكاری و كرێكاری واتە خەباتی ئازادی بۆ ئازادیخازی و دیموكراسی راوێژكاری نەبووە هۆی دامەزراوەی كەلە خاك بەرهەم هاتبێت بەلكو **قۆناغی دامەزراندی دەولەت ئیسرائیل بەرێگای ساخركردنەوەی خوێنی گەلانی هەرێم لەم شۆرەشە دامەزراوە وەك پیشتینە راگری بەرگری پەرتەوازەی بەكارهاتووە**، لەترسی رووخانی تەلئەڤیف بەهۆكاری هێرشی ئقلمیی لە نیشتیمانیعەرەبیدا، كەواتە جەنگی پرۆكسی خەباتی كورد لە باشووری عێراق جۆرێك بوو بۆ غافلكردنی سوپای عێراق تاكو لەمەترسی سوپای هاوبەشی عەرەبی شۆڤێنی سوونە بۆ سەر دامەزراوەی جوولەكە رابگرێت و دووری بخاتەوە، بۆیە بۆشاییەك لە تاوان بۆ لەناوبردنی صدام حیزب و جەماوەر و حكومەتەكەی بەهاوكاری شیعەی ئێرانی لەكارنامەی جینۆساید و راگواستن و كیمیا بارانكردن لە شانۆی سیاسی شاراوە لە ناسنامەی عێراقی عۆجە تۆماركرا واتە تۆلەی سیاسی شیعەگەری لە جەمسەری سوونەگەری لەلایەن دارێژەرانی سیاسەتی ئیمپریالیزم بەرێوەچووە كە لەبەردەم سەركردایەتی كورد خێزان و گوند و كلتور وەك دیواری جەنگی خوێناوی لە پرۆسەی هۆلۆكستی خۆرئاوا دارژایەوە بۆئەوەی لە داهاتوو وەك مژدەیەكی كرچوكال و پەیمانپێدانی بە دامەزراندنی دەولەتی كوردی لەرزۆك لە سێبەری ئیمپراتۆریەتی زایۆنی و پرۆژەی ئیبراهیم بۆ ئاشتی و جەنگ زیندوبكرێتەوە.

دابەشكردنی رۆژهەلاتی ناوەراست لەسەر میراتی عوسمانی و سەفەوەی بۆ جەمسەری رژێمی و مەزهەبی و راگرتنی دەسەلاتی لەرزۆكی بنەمالەی میراتی و خێلەكی و رۆحانی بەدیدی من، هیچ لە ئەدای سیاسی ناوەخۆی ئەم خالەی نێوان ئاسیای و ئەفریقا و ئەورووپا ناگۆرێت بەلكو جۆرێكە لە هێشتنەوەی حكومەتی لەرزۆك و گرووپی ئۆلیگاریشی و چەتەی سەرمایەدارییە، **هێلی دابەشبوونی زەوی** لە ناوەراستی بۆ خوارەوە، سەرچاوەی سامانی سروشتی و رۆحەیەتی ئاینی ئاسمانیە بەلام لەبەشی باكووری زەوی دامەزرێنەری ولاتانی پیشەسازی و **چەقۆكێشی سیاسی و ئابووری میراتی** و هزری دامەزراوەی خاكی بێ رۆحەكانە كە تەنها (كۆكردنەوەی دراو و چەوساندنەوەی مرۆڤ) لە پرۆژەی گەوجاندنی ئایدۆلۆژی و عقلی و جەستەی (تەعمیم) كراوە بەسەر بەشی باشووری زەویدا دەچەسپێت، بۆیە ولاتانی زەوی باشوور رۆژدوای رۆژ (گێل و نەزان و مشەخۆرن) وە سامانی سروشتی ئەم ولاتانە بەشێكە بۆ راگرتنی ئەم دەسەلاتە گێژانە لەپایەی بردنی (خامی سروشتی و هێشتنەوەی لە كورسی)دا. كەواتە گواستنەوەی شۆرەشی خێزانی جوو بەرێگای یەكگرتنی پەرتەوازەی و دووبارە بەخشینی دەسەلات بەو خێزانە جولەكانی كەلە جیهانی لە دەسەلاتن لە پێگەی هەرێم و دەولەتی گەلان، نیشانەی پرسیارە بۆ داگیركردنی گۆی زەوی لە جەستەی خێزانێكی جوولەكە كەبەهۆكاری ترسی لەناوچوون گۆراون بۆ ئاینی ئیسلام و مەسیحی و بێ ئاین، ئێستا ئەم ئایدۆلۆژیە لە جەستەی ئیسلامی دیموكراسی و رادایكالی میراتی پاشاخانی

جوولەکە بەڕێوەدەچێت. واهەست دەکەم میراتی خێزانی من جوولەکەبێت کە پاشماوەی هاوسێ دیهاتی جولەکەکان بووە، بۆیە (تەعمیمی جوو) واتە بردنی زەوی لەگۆشەی میراتی شۆرەشی پەنابەران و ڕاگواستن و تێکەلبوون و گۆڕینی ئاین، جۆرەکە لە کارنامەی جیهانی زایۆنیزمی جیهانی بەسەر ناوەخۆی گەلاندا.

ئەمە بۆچوونەکە کە من لەرووی مێژووی و بەرکەوتنی پاشماوەی دیهاتی و گۆرستان و خێزان بەرچاورۆونی تەواو بەمن دەبەخشێت بۆچی گەلی کورد بەزۆرینە جوولەکەیە نەوەك پێکهاتی گەلانی بچووك لەناوەخۆی هەرێمدایە. خێزانی کورد لە کوردستانی باشوور زۆرترین پێگەی میراتی جوولەکەی بەردەکەوێت لەدوای گۆڕینی ئاین و جیۆسیاسی و پێکهاتەی نەتەوەیدا. کەواتە سیستەمی دامەزراوەی هەرێمی باشوور لەسەر میراتی ڕاگری دەسەلاتی جوولەکە دامەزراوە بۆچی؟ چونکە رەفتاری خێزانی کورد لە میراتی جوولەکە نزیکە وەك **گەشت و سەیران**، ئەگەر خێزانێك 4 کەسبێت زیاتر لە 300م زەوی داگیردەکات لە کاتژمێری یەکەم تا 24 کاتژمێری داهاتوو؟ شێوازی **دیوەخان هەمان فۆرمی داگیرکاری زەوی وەرگرتووە**، شێوازی دانیشتنی پیاوی کورد هەمان فۆرمی لۆژیکی جێگیربوون لە زەوی وێنەی خۆی دەنوێنێت. واتە جوولەکەی ڕەسەن لە ڕۆژهەلات ناوەراست تەنها (کوردە) کەبەهۆی بەرکەوتنی جەمسەرگیری جەنگی ئیمپراتۆریەتەکان قۆناغی گەشە و پوکانەوەی خێزانی کورد بۆتەهۆی پەرتەوازەی لەناوەخۆی باشووردایە. ئەگەر **کورد ئاری بێت و یان لەنەوەی خێزانی پێغەمبەر سلێمانە کە قژ زەرد و چاو شین و سۆر و سپی بێت**، دەبێت خێزانی کورد بەهۆی ئەم بەرکەوتە ژینگەییە خۆی لەم قۆناغە پێشکۆتاییەی سەدەی 21 دۆزیبێتەوە. واتە شۆرەشی شۆردنەوەی خێزان و تیر و عەشیرەت و ئاین بۆ دواقۆناغی چاخی ئاسن هۆکارێکە لە کۆکردنەوەی نەتەوەی گەلان لە جیهانی کۆمەلگای دیجیتالی ژمارەیدایە.

هەموو جیهان لە کەمینەی (تۆی جوولەکە) دووگیانە کە کلتورێکی (نارەسەنی بەرهەمهێناوە) لە بۆشای ئاین و خێزان و زەوی و ئاشتیدا. ئەم وێنەگەورەی کەباسمکرد زۆربەی **هەزرڤانان باوەڕیان بە جیناتی کوردنیە لە پێکهاتەی DNA لە نێوان بلاوبوونەوەی جوولەکە بەسەرزەوی و دامەزراوەی جەنگی ئیمپراتۆریەتیدا**. بۆیە من لە بابەتی رابردوو چەقم خستە سەر پێگەی کورد لەباشوور لە پێکهاتەی سیاسی و دامەزراوەی حکومی و حیزبی و مایکرۆجەماوەری، بەرچاورۆونی دابە ئێمە کە سیستەمی سیاسی گەلان لە زەوی باشوور لە گۆشەی بەرێکردنی چاخی دامەزراوەی داهاتووی زایۆنزیمی بەڕێوەدەچێت لە سێبەری ئاین و نەتەوە و خاك و ئاشتی و جەنگدا. وێنەی ئەم خاکە لە کالای سیاسی باشوور کوردستان وێنەیەکی ڕۆژانە دەخاتە سەردیواری شانۆی ڕاگەیاند و بازاری ئابووری سەرنجراکێش لە پەخشی دیموکراسی پۆلیسی دیجیتالی نمایش دەکرێت. وەك وەرگەران و سووتان و ڕووداو و هاتوچۆی تەنکەری نەتەوت لە شەقامد ، باخود **کوژرانی دووکەس لە مەیدانی تەنکەری گواستنەوەی سووتەمەنی لە شارۆچکەی کەلەك و نزیك یالاوگەی کارگروپ**، وەك بلۆگەرێکی سەربەخۆ لە چاخی دیجیتالی لەرووی رەوشتی دەروونی، من بەشێکم لە شەرعیەت پێدانی پەرلەمانێکی ناشەرعی سیاسی لە دامەزراوەی کەمینەی دەنگی ستراتیژی و وەرگرتنی دەنگی عەوامی نەخوێندەوار بۆ بەرزرکردنەوەی ئاستی پێکهاتەی حیزبی و جەماوەری بەناوی حکومەتی هەرێم لە ئۆتۆنۆمی نەتەویدا. دەبێت تاوانی من چ بێت کە جیهانی جەمسەرگەری G7 وەك ڕاگری خالی هاوسەنگی باشووری ئاسیا و ڕۆژهەلاتی ناوەراست بێت، بۆچی لەسێبەری ناتۆ و ئەمەریکا و جەمسەری کۆمەنیستی نوێ و دەستووری کلتوری مەزهەبی و نەتەوەی عێراقی فیدرال، **ڕۆژانە نەوت بەنرخی 30$ و 40$ بۆ هەر بەرمیلێك بەهاوکرای چەتەی سەرمایەداری و خەباتی نەفتخۆرەکان ئەم پرۆسەیە بەرێوەبچێت**. ئاژانسی ڕۆیتەر بەشێکە لە گروپی G7 و هێزی شاراوەی کاپیتالیستی زایۆنیزمی؟ یان ئەمە جۆرێکە بۆ هێشتنەوەی دەسەلاتی کوردی جوولەکە ئاینگۆراوە بۆ هێشتنەوەی جیۆسیاسی باشوور لە چوارچێوەی پێشهات و دواهاتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست و جەمسەری ڕاگری ئاسیا و ئەوروپایە؟

**لە وەرزی هاوین نرخی یەك بەرمیل نەوتی مالان لە 130 هەزار دینارە** لە وەرزی زستان 230 هەزار دینارە. کەواتە بۆچی لە بازاری رەش کە ڕاگری حکومەت و حیزب و میدیا و جەماوەرە لە پێگەی ناتۆ و بریکسدا **خەلکی کوردستان کۆچ دەکات بۆ ولاتانی خۆشگوزەران** لەپێناو (نان و خاك و ئاشتی) وەك کۆیلەی مۆدێرن خۆی پەنادەوە لەم کارەساتە لە میراتی شۆرەشی پارتیزانی نەفتخۆرەکاندا کەچی دووبارە **لە (تاراوگە) هەمان کۆیلەی عەیار 24ی دەسەلاتی سیاسی ناوەخۆی کوردستانی باشوورە بەناوی (گەمژەی کۆنەپەرستی نەتەوەی)** هێشتنەوە و شەرعەیتدانی حکومەت و حیزب و پەرلەمان لە شکۆی (دیوەخان و تەکیە و گۆرستان و خێزاندا). خێزانی کورد لە چاقی پێشکەوتنی جیهانگیری لەناوەخۆی ولاتانی خۆشگوزەران و پیشەسازی بەردەوام وەك (دەروێش) دەفی نەزانین بۆ میراتی ئەم شۆرەش و نەتەوە شێواوە کرنۆشی بۆدەبات. کەوات سەرجەم گۆشەی حکومەت و حیزب و جەماوەر لە داهاتووی بەردەوام بەتالە بەهۆی میراتی شۆرەشی (جوولەکەگەرای) لەناوەخۆی ئاینی گۆڕا و هێشتنەوەی خێزان لە پێگەی دەسەلات واتە بەردەوامیدانی یاری (سەگ و خاوەنەکەیە) لەناو مالدایە. لەوانەیە خێزانی من جوولەکەبێت یان (**باشوورجوو**)بێت لە میراتی

جوولەکەگەرای کە چاوێکی بچووك و کەپووێکی گەورەی هەیە، بۆیە ئێمەی باشوورجوو وەك کۆیلەی نەتەوە پەرستی جۆرێکە لەمل شۆری ئێمەی خەلکی باشوورین کە هۆکارین بۆ هێشتنەوەی زۆرینەی خۆمان بۆ پێدانی شەرعەیت لە کەمینەدا.

**ئەم ناوەرۆکە دوورە لە رەگەزپەرستی بەلکو راستی هەوێنی هزری بیرکردنەوەی منە لە کوردستانی باشوورجوودا.**

# باڵدار لە بیرەوەری مندا

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : بیرکردنەوەی پەتی
بەروار : 12ی 7ی 2024

لەماوەی رابردوو بەهۆی شکەستی ئابووری سیاسی ناوەخۆی هەرێم لە پێگەی ئۆتونۆمی خۆرێبەری دەولەت بازنەی پێکهاتەی فیدرالدا، خەریکی فرۆشتنی پەرتووك بووم لە شەقامەکانی شاری هەولێر، بەهۆی بێ کاری و کەمی داهات ناچاربووم درێژە بە پیشەی **(ئابووری سوتاو)**بدەم بۆ ئەوەی ژیانێکی ئاسای لە **(بەهار کوردستان کەر تێدا برسیە)** بمێنمەوە و نەبمە قوربانی سیاسی و حیزبی و جەنگ و سەرباری خۆراگری لە پێگەی کۆمەلگای کوردی کە دەرفەتی پێدام بۆ تاراوگە بەلام مانەوە باشترە لە سێبەری کۆیلەی مۆدێرن و خۆهەلواسین بە حیزب و ئابووری کۆمپرادۆری لەناوەخۆی هەولێردا، زۆربەی جار لە نێوان من و چاودێری سەربازری دەبووە دەمەقالێ بەهۆکاری ئەوەی سیمای شار دەشێوێنم چونکە ولاتانی ناتۆ و هاوپەیمانان و گەشتیاران و کۆمپانیاکان بەچاوێکی نامۆ تێکەل بە ژینگەی فرۆشتنی پەرتووك دەبین لە شەقامی هەولێر لە دید و بۆچونی (ئەوان). کۆتا وەلامی من ئەوە بوو من میوە و سەوزە نافرۆشم تا زوو بفرۆشرێت و برۆمەوە، ئەمە پەرتووکە فرۆشی خاوە بەلام کریاری تایبەتی هەیە، رۆژانە من و پەرتووکی ئەلفوبێ کوردی (باڵدار) لە شەقامی هەولێر راکە ڕاکە و خۆشاردنەوە بوو لە دەستی چاودێری سەربازی، ویستی من پەیداکردنی **(نانی سوتاو لەسەر ئابووری لاوازی تاك)**دا لە هەمان کات بە دیموکراتیزەکردنی شۆرەشی شەقام بۆ کرینی پەرتووك پەیرەوی بکەم. کەواتە هەردوو ئامانجکە شەکەستی هێنا بۆ رزگارکردنی خێزانی کورد لە شۆرەشی نەتەوە پەرستی کۆن لەناو ئابووری دیجیتالیدا.

بەردەوام لەناوەوەی هەولیر و دەرەوەی خەریکی فرۆشتنی پەرتوك بووم، رۆژێکیان لە شارۆچکەیەك لە دووریانی گشتی وەستام، کۆمەلێك گەنج بەم زاراوەیە وتیان **(پەرتووك خوێندنەوە کارێکی پووچە، شولەکا پیچە)** دوای یەك کاتژمێر بە کتاب ئۆتۆمبێل راپێچی بنکەی چاودێری کرام لە دوورەوە منیان راگرت و هەر چوار دەرگای ئۆتۆمبێلیان کردەوە پەرتووکەکان سەراوبن کرا لەدواتر سەرجەم زانیاری کەسی و خێزانیم تۆمارکرا ووتی **(لە ژیانت لەم ناوە نەت بینمەوە). ووتم منالی پێشمەرگی دێرینم؟**هیچ هەلوێستی نەبوو بەناچاری خۆمکۆکردەوە و رۆیشتم. لە چەند رۆژی دواتر لە شەقامی ناحیەی دارەشەکران وەستام، کەس دیناری بە پەرتووك نەدا، گەنجێك **ووتی ئەم ئیشە بکە، (چەك فرۆشت و مۆبایل) زۆرترین قازانج و فرۆشت هەیە**. هیچ وەلامم نەدایەوە لەگەل باڵدار کۆچمان کرد بۆ مالەوە. بیرمکردەوە لەبەردەم مزگەوتی بوخارە بوەستم وەستام بۆ فرۆشتنی پەرتووك، کەسێك هات ووتی، **برام پاقلاوە بفرۆشە لەم کارە باشترە، منیش ووتم، وەرگی خەلك بەمن تێرناکرێت، ئەگەر عقلی تێرنەکرێت**، رۆژانە لە کاتژمێر 5 ئێوارە تا 12 شەو زیاتر لە 200 هەزار دینار خەرجی خەلکی ئەم شوێنەبوو بۆ کات بەرێکردن بە دەم خواردنەوەی چا و خۆراکی خێرا، بەلام لە خۆراکی عقلی و هزر هیچ کەسێك نرخیان بە پەرتووك نەدەدا، واتە زۆرترین پەرتوکی ئاین و خۆپاکردنەوە لە تاوان جۆرێك لەبازاری پەرتووك فرۆشی داخزانی بەخۆوەبینی وە لەبەرامبەر خۆجوانکردن لە شوێنی گشتی و ناو مالدا. **کەواتە باڵدار هیچ نرخی نیە بەهۆی خێرای چاخی دیجیتالی و گۆرینی زانست بۆ زانیاری و بەرکەوتەی ئابووری سەرنجدان.**

رۆژێکیان لە بەردەم باخچەی پێشمەرگە وەستام کاتژمێر 5 ئێوارە، لە بەرامبەرم **لەمالێکی دەولەمەندا دوو هەرزەکار هاتن داوای پەرتوکیانکرد بە زمانی کوردی لاواز بەدوا پەرتووکی ئیمپرالیزم دەگەران، ووتم نیمە و نافرۆشم بە دلساردی و غەمگینی گەرانەوەمال**، شەقامی هەولێر و باشوور لە زمانی کوردی گەرانەوەی سەردەمی رژێمی عێراقی وەرگرتووە کە بەزمانێکی تێکەلەی عەرەبی و کوردی ناوەرۆکی نووسراوی سیاسی و مێژووی تۆمارکراوە، ئێستا زمانی کورد لە گۆشەی داخزانی کلتوری بیانی بەرێژەیە کە رێگای زانکۆ و پەیمانگا و قوتابخانەو داینگا رێگایەکە بۆ بەبازارکردنی زمانی ئیمپرالیالیزم لە گۆشەی (دۆلار

دیبلۆماسی) خێراترین **بازاری فێربوونی زمانی دەروونی** و بازاری خزانی بەخۆیوەبینیوە کە پێدەلێن ئابووری ئازاد و هاوەردەکراوی کۆمپرادۆری سیاسی دۆلار دیبلۆماسی بۆ شۆرەشی نەفتخۆراندا.

لە کەسێکم پرسی کە کریاری سەرەکی پەرتووك بوو، **ووتم منالەکەت قسەی کوردی دەکات؟ ووتی فولە واتە تەواو دەزانی بەزمانی کوردی قسە بکات بەلام لە نووسین و خوێندن هیچ نازانێت.** ئەم چاوگە زیندوانە لەناوەخۆی کوردستانی باشوور جۆرێك بوو بۆ راگرتنی دەسەلاتی حیزب و حکومی و کۆمپانیای و جەماوەری لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمی دیموکراسی و دۆلار دیبلۆماسیدا وەك گواستنەوەی دلسۆزی کلتوری دیموکراسی و سەربازی بەناوی هاوپەیمانی دژە تیرۆر لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا. کۆتا وێنەی خوێندنی کورد بێنمەوە ئەویش لە **پەیمانگەی پێشەنگ لە وانەی ئەدەبیاتی کوردی تایبەت بە مێژووی خانەیٚ لەپزێرن، گفتوگۆری گەرم بوو لەگەل مێژوو و قوتابی مامۆستا، لەناکاو قوتاییەکی هەرزەکار بەناوی حمە سناپ، ووتی مامۆستا ئەمە بۆ ئێمە نابێت و سوودی چی و جیهانی ئێستا لە پێشکەوتندایە هیچ کەس وەلامی نەبوو.** هەر لەهەمان پەیمانگا، **رۆژێکیان مامۆستایەك ووتی بەتەمای زمانی کوردی بین حالتان خۆشدەبێت لە ناوەخۆ و دەرەوەی کوردستان، ئەم زمانە لە داهاتوو زۆرینەی خەلك لێی دوور دەکەونەوە بەهۆی گۆرانکاری جیهانگیری.** کەواتە ئەم وێنە زیندوانە هۆکارکە بۆ ئەوەی تاکی کورد دوور بکەوێتە لە مێژووی ئەدەبیاتی زمانی کوردی و فێربوون و خوێندنەوەی ئەلفو بێی بالدار، **ئێستاش بیرم دێت لەسەر شەقام لەکاتی ئێواران، وانەی کوردی بەرێگای پەرتووکی بالدار، کەسێکی نەخوێندەوار فێری زمانی کوردبوو بەرێگای نووسین و خوێندنەوە،** کە بیردەکەمەوە لە قوتابی پۆلی یەك لە قەبارەی پەرتووك و دواکەوتنی فێربوونی زمانی کوردی سەرباری دابرانی منالان لەیاری مادەی بەرکەوتنی جەستەو عقل گۆراوە بۆ جیهانی **(تەپادۆر تەپادۆر وەلا بە بابەی دەلێم بووکە شوشەم بۆ بکرێت ئەوها دەکەم هێێێێێیێ).** [زمانی و خێزانی کوردی هێێێێیێ.]

زۆرجار دەلێن گۆرانکاری جیۆسیاسی رۆژهەلاتی ناوەراست دەبێتە رووخانی حکومەت و دواخستنی هەلبژاردن و پەککستنی ئابووری ناوەخۆی و بەناوی کەرتی تاییبەت و نیولیبرالی کۆمپرادۆری دۆخێکی شلەژانی لەناوەخۆی باشووری کوردستان ئافراندوە، بوو بە شەرم ئەگەر ناسنامەی بازاری کۆمەلایەتی دیجیتالی نەبێت سەرباری زمانێکی شوور لە ئینگلیز و عەرەبی و ولاتانی دراوسێ، **ئەم جۆرە زمانانە ناتوانی تاکی کورد لە پرۆژەی هزری پەتی بیربکاتەوە بنووسێت بەلکو زمانێکی دەروونی و بازاری و کلتوری بیانیە بەسەر جیهانی ولاتانی سێیەم و جەمسەری کۆمەنیستی نوێدا زالکراوە،** واتە لە دوای جەنگی دووەم لە جیهاندا بەرێگای دیبلۆماسی (نوێنەری) و ئالوگۆری کلتوری، جۆرێك لە داخزانی شۆرەشی جەنگی زمان و ئەدەبیاتی داگیرکراوی ئیمپریالیزم لەناوەخۆی جیهان بەبازارکراو دژ بە ئابووری کۆمەنیستی نوێ و خۆبەخشی. کەواتە کرداری فێرکردن و نووسین و خوێندنەوە لەناوەخۆی باشوور لە فرەکلتوری و هەمەرەنگ ئاوسبووە کە کۆمەلگای کوردی بە پێشکەوتن و شاگەشکەی کەکەسی تاك لە (جاهیلی مۆدێرن - نەزانی نوێکار) خۆی نمایش دەکات بۆ سەرنجدانی خۆی وە بەپێچەوانەوە کە دوورە لە زمان و فەرهەنگی کوردی وەك فێربوون ل ئەلفوبێی بالدار.

**چاخی دیجیتالی تەکانی بە ئەدەبیاتی کوردی خست بەهۆی دواخستن و دورخستنەوە لە نووسین و خوێندنەوەی پەتی بۆ دیجیتالی و وەرگێرانی خێرا وەك گۆگل و مایکرۆسۆفت و کۆمەلێك کۆمپانیای بیانی بۆدەست گەیشتن بەناوەرۆکی دەقەبلاوکراوەکانی زمانی کوردی لە تێگەیشتنی تاك و جیۆسیاسی و هەوالگری ئەم کارنامەیە دامەزراوە بەناوی خزمەتکردنی کورد و خاك،** بەلام کورد بە دەستپێشخەری دەزانی لە سەدەی 21 کەچی سەرجەم ناوەرۆکەکان لە تابلۆی فرۆشگا و مۆل و بالەخانە و هی تر بەزمانی کوردی لە مانای بیانی خۆی نواندوە بۆ ئەوەی گەوجاندنی حکومەت و خەلك و گەشتیاری، وێنەیەکی نەرم ببەخشێت بەشەقام و کلتوری شارو دێهاتەکان لەناوەخۆی هەرێمی باشووردا، ئێستاش پەرتووکی بالدار لەسەر رەفی کتێبخانەی مالەوە داندراوە وەك یادگاری و زیندوکرنەوەی زمانی کوردی لە جیهانی ئابووری سەرنج راکێشدا. **کەواتە دامەزراوەی ناوەخۆی لە پێکهاتەی گشتی حکومەت بەرێگای سیاسی و ئابووری و سەربازی هیچ کاریگەری نەرێنی دەرەکی بەسەر ناوەخۆ رووناداتت بەلام قۆناغی باشوور لە وەبەرهێنانی ئابووری مرۆی بۆ هاورد و راوێژکاری ئەم جۆرە کۆمەلگا کراوە و داخراوە بەرهەم دێنێت کە بەمۆدێلێکی جیهانی شاگەشکە دەبێت و هاوردەی دەکات وە بەکاریگەری رووداوەکان دەرووخێت و کۆچ دەکات چونکە بناغەی دامەزراوەی کوردی پەتی نیە بەلکو خێرا و بێ ناوەرۆکە وەك زانستێکی کۆپی و زانیاری دیجیتالی و بەسەرچووە لە ناوەخۆی کوردستانی باشووردا** بۆیە من وەك پەرتووك فرۆشێك لە شەقام دەرکرام و ئەلفە و بێی بالدار کرا (بەی بی فینگەر) لە ئابووری کلتوری سەرنج راکێشدا. بەناوی پاراستنی قەواری باشوور لەترسی لەدەستدانی شۆرەشی خواردنەوەی نەفتاودا.

# چەکی ئەتۆمی لە ئەدەبیاتی کوردا

بلۆگەر : جەودەت احمد
بابەت : هزری پەتی
بەروار : 13ی 7ی 2024

دوێنێ یادی بالداربوو، کە بەدامەزرێنەری بناغەی فێربوونی زمانی کوردی خاوەندارێەتی لە مافی ئەدەبیاتی کوردی پارێزراوە، چونکە سەرەتایەکی شۆرەشی نووسین و خوێندنەوە و قسەکردنە لە زمان و ئەدەبی کوردی واتە تاکە رێگا کە زمانی کوردی بە (دیموکراتیزە)کرد لەلایەن ئەم بەهرەدارە، ئەلف و بێی کوردی، یاسای دەستپێکردنی ژیانێکی نوێیە لە ژیاری کۆمەڵگای کوردی پەتی لە کردنەوەی دەرگای هیوا بۆ هەموو چین و توێژێکی ناوەخۆی کوردستانی گەورە و مێرنیشینی سۆرانی سەدەی 20 و تێکەڵ بوون بە دارێژراوی کارنامەی دامەزرێنەری ئەدەبیاتی سورمانجی واتە لێکدان و تێکهەڵکێشکردنی ووشەی کوردی پەتی لە سۆران و بادینان جۆرێك لە دارشتنەوە ئەدەبیاتی کوردی و فێرگەی منالان لە ناوەخۆی مال و خوێندنگا وشەقام و پییادگای رێبەری ئەدەبیاتی کوردیە.

بۆیە لەدوێنی و تائێستا بەکەمترین رێژە یادی ئەم داهێنەر کوردییە پەتیە کراوە کە نەبووە هۆکاری شۆرەشی دیجیتالی لە گەیاندنی ناوەرۆکی بابەتی کوردی لە فێربوونی زمان و نووسین و خوێندنەوە وەك ناوەرۆکی ئەدەبی و تێکەڵ بوون بە کۆدی شاراوەی جیهانی چاخی ژمارەی واتە (دیجیتالی). هۆکاری ناهۆشیاری تاك بە کارە نافرمیەکانی دامەزراوەی گشتی و تایبەت و جەماوەر لەم رۆژە زیاتر چاوخرا سەر پرکردنەوەی پێداویستی خواستی ئارەزوو و بەکاربەری مانەوەی رۆژ کە سەرجەم سەردێر و بلاوکراوە و بەرکەوتنی لافاوی کارنامەی دەروونی لە ناوەخۆی هەرێمی باشوور بەتەواوی کۆمەڵگای کوردی دورخستوتەوە. هۆکاری ئەم دوو رخستنەوەیە بێنرخ کردنی رۆحیەتی تاك لە ژیار و بەرکەوتەی دەوروبەر وای کردوە بەردەوام خەریکی پرکردنەوەی ئارەزووی رۆژان و دەرخستن و داخزانی کلتوری لەناوەخۆی پەتیدا دەبێتە شانۆنامەی سەر دیواری کۆمەڵگای ژمارەی واتە (دیجیتالی).

تا ئاستی حەزی دەروونی و ژمارەی لەناوەخۆی ئێمە بەرزبێت کاریگەری نەرێنی بەسەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی دادێت چونکە خواستی پرکردنەوەی بۆشای کات، زالە بەسەر وەبەرهێنانی ناوەخۆی کە ئابووری مرۆی لەرووی جەستی و هزری و زانستی و بەکاربەری دوور دەخرێتەوە بۆ خۆشگوزەران سەرنجدان لە سەردەمی سەرەتای ناوەراستی سەدەی 21، بۆیە ناهۆشیاری تاك و دامەزراوەی گشتی و هەولاتی ناتوانێت بەردەوام ئەم بۆشاییە پربکاتەوە بۆ ئەوەی رێژەی بەکاربەرانی خواستی داواکاری رۆژانە هاوسەنگ بکات لەگەل بۆشای کات لە خەوتن و خواردن کە لە ماوەی 24 کاتژمێر زۆرترین ناوەرۆکی ژمارەی (دیجیتالی) لە کورتە گرتەی تراژیدی و گالتەوگەپ لە دەروون و جەستەی ئەم تاکە پربکاتەوە، کەواتە کۆمەڵگای نەخوێندەوار و دوورە دەست لە بێئاگای نووسین و خوێندنەوە و ئەدەبیاتی زمانی کوردی ناتوانێت لە پێگەی سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆی خۆی رێکبخاتەوە ئەگەر هێزی ئەدەبیاتی پەتی لەگەل نەبێت.

بۆیە یادی بالدار و سەرجەم کەسایەتی نووسەرانی کورد لەبۆشای ئەم ژیارە گومدەبن و لەهزر و دەروونی خەڵك دەتوێتەوە وەك ئەو سەهۆلەی لەبەردەم گەرمی و هەوای پالەپەستۆی فیزیکی کە ئاراستەی هێز دەخاتە سەر ئەم (بەفرە رەقە) دەبێتە ئاو دواتر ئاسەواری ئەم تەڕاتیە نامێنێت. چونکە شەپۆلی کلتوری بیانی لە رێژەی بەهۆی خێرای کات و وەبەرهێنانی زانستی ژمارەی، کە جوانکاری بەخیشەوە بە دیوارێ ژمارەی وەك ژێری خۆرێبەری و بازاری ژمارەی و یاری ژمارە و مامۆستا لەگەل بیرکاری وادەکات ئاراستەی شەپۆلی گەلانی نەتەوەی لە هەرێم و دەولەتدا دوور بخاتەوە بۆ نوێبوونەوەی جیهانگیری بەناوی خواست و پرکردنەوەی بۆشای کات.

### چەکی ئەتۆمی نەتەوەی کورد

ئەم دەستەواژەیە لە ژیاری پەتی رۆژانە هەڵقولا بەهۆی بەرکەوتنی رووداوەکانی رۆژ و راگەیاندن لە چاخی زیرەکی وەك سەردێرك کە دەولەت نەتەوەی عوسمانی مۆدێرنی سوونە بەهۆی کێشەی جیۆی سیاسی و ئابوری و ئاسایشی جیهانگیری کێشەی گواستنەوەی تۆربایێنی دامەزراوەی چەکی ناوەکی هەیە کە گیری خواردووە لە خالی گەیاندنی دەرەکی ولاتی ئەلمانیا و کێشەی پیتاندی ناوەکی تەهران و مێژووی لەناوچوونی ناوەکی عێراق لەلایەن ئیسرائیل، ئەم رێژە لێکدراوە لە گەیاندنی زانیاری گشتی بۆ تاك، توانمی جۆرێك لە چەکی ئەدەبی ناوەکی واتا (ئەتۆمی ئەدەبی) بەرهەمبهێنم بۆ نوێکردنەوەی زەوی لە خەڵك و دەسەلاتدا.

کەکاریگەری گەورەترین وەشانی گۆرینی جیهان بکات لە جەمسەری کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال دیموکراسی و رژێمی و میراتی و کاریزمای واتە ئەم جۆرە چەکە ناوەیەکی خێزانی کورد هۆشیار دەکاتەوە لە (تعمیم کردنی تا بۆ گشتاندنی هۆشیاری گشتی) واتە لەدایکبوونی چەکی ناوەکی ئەدەبی کوردی پێویستی بە تێچووی سەرمای ژێرخانی ئابووری نیە سەرباری لۆبی و پشتگیری ئقلیمی و جیهانی بۆئەوەی رەزامەندی وەربگرێت ئەم جۆرە چەکە بەرهەم بهێنێت تاکو وەك هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی و هێزی خۆی نمایش بکات لە ناوبڕی زلهێزان، ئەم رێگایە دوورە و ناتوانێت سنووری کاپیتالیستی ئۆلیگاریشی و چەتەی سیاسی و سەربازی و ئابووری ببرێت لە جیهانگیریدا، ئەم لۆبیە و پیشتگیرییە لە هێزی کالای سیاسی باشووری هەرێم وەبەرهەم نابیەت چونکە لە شەقام لەدایك نەبووە بەلکو لە جیهانی ئقلیمی و ئیمپریالیزم هاتوە سەرزەوی واتە لە هێلکەدانی ئقلیمی و سپێرمی (تۆی) زلهێزان ئاوەسبووە و ئەم مندالدانە لە خاکی کوردستانی باشوور چاوی بەژیان هەلناوە بۆیە دەبێتە پاشکۆی راوێژکاری دۆلار دیپلۆماسی.

کەواتە ژینگەی هەرێمی باشوور لەبارنیە بۆ دامەزراوەی ئەتۆمی بەهۆکاری مەترسی تێکچوونی ئاسایشی دراوسێیان زلهێزان لێرە دۆخی باشوور بە مردووی لە ژیانی رۆژانە دەخولێتەوە بەناوی چەکی ئەتۆمی نەتەوەی کورد لە بەرگری و مانەوەدایە. ئەگەر لەسەر نەخشە تێرامانمان هەبێت بۆ (خاك و زمان و ئاشتی) خالێکی رەش وەك ناوکی گەردیلەی ئەتۆمی لە شوێنی خۆی یاریدەکات بەردەوام لەهەلبەز و دابەزدایە، کەواتە چەکی ئەتۆمی نەتەوەی کورد بوونی هەیە بەلام پێویستی بە دیموکراسی راوێژکاری ئازادی و ئازادیخواز هەیە لە دۆزینەوەی ناوی کورد لە ناو خاك و ئاشتیدا، بۆیە ئەوەی لە رابردوو ئەنجام دراوە بۆ پیتاندنی چەکی ناوەکی نەتەوەی کورد تەنها لە گۆشەی هێشتنەوە و سەرکوتی و بەرگری دابووە هیچ وەبەرهێنانی لەناوەخۆی نەکردوە بۆوێنە تیرۆرکردنی کەسانی سیاسی و ئابووری و سەربازی و رۆشنفکری ئەم گۆشەیە لە تیرۆر و بچووککردنی پرۆژەی ئەتۆمی نەتەوەی کورد بووە نەوەك گەش و فراوانکردنی. واتە کێشەی کورد لە گەورەی بە بچووکی نمایشکراوە بۆیە نەبۆتە جیگای باس و پشتگری سەربەخۆی.

**خاك :** واتە دامەزرێنەری بنکەی ئەتۆمی لە سروشتی نەخێشنراوی کوردستانی گەورە کەدەبێت دەنگی خاك واتە رەگەزێکی مێنە دلسۆزە بۆ پەروەردەکردنی بێچووەکەی لە پیتاندنی ئاو و هەوا و خاك لەدایك دەبێت بۆیە پیتاندنی چەکی ناوەکی زۆرئاسان بەرهەمدێت لە خاکێکی داگیرکراوی زیندانی ئقلیمی و زلهێزی. گۆرینی دلسۆزی و رەفتاری لە هەوێنی خاك بەگێرانەوەی بۆ مێژووی کلاسیك جۆرێکە لە هێزی کۆکراوەی پاشاخانی سوتەمەنی بۆ بەرهەمهێنانی ئەم چەکە ناوەکیەدا.

**زمان :** ئامرازی گەیاندنە بۆ ئامانجێکی قول کە بەرێگای گێرانەوەی رووداوەکان و گۆرینی بۆ ئەدای (رەوانبێژی) ناوەرۆکی پیتاندنی چەکی ئەتۆمی لە ئەدەبیاتی کوردی، بەگێرانەوەی ناوەرۆکی ژیاری کوردی لە لاشەی رۆمانێکی درێژو کورت یان چیرۆکێکی ناخەهەژێن دەبێتە هۆی گەیاندنی پەیامی شاراوەی رەوانبێژی پیتاندنی چەکی ووشە و چیرۆك لە ئەتۆمی ئەدەبیاتی مێژوو و رووداوەکان بەیکەوە هەوێنێکە لە گۆرینی جەستە بۆ رۆح و نوێبوونەوەی بۆ هزر و ژیری، دەبێتە سوپایەکی شاراوەی لە ناوەخۆی ئەدەبیاتی کوردی بەرووی جیهاندا، لەهەر ئەگەرێکی دیاریکراو ئەم چیرۆکانە لە بەیەکگەشتنی رابردوو لەگەل ژیاری رۆژانە هۆشیاری پەتی بەرهەم دێت و تاك لەقۆناغی (رۆشنبیری گەمژەی و جاهیلی مۆدێرن) رزگاری دەبێت.

کەواتە زمان دەرخەری چەکی شاراوەی زیرەکی زاخاوی دەوروبەرە بە ئاراستەکردنی هزری تاك بۆسەر دەورووبەر بە ئاسانی تێگەیشتنی لە رووداوەکان بۆی ڕووندەبێتەوە ئەم تاکە رەفتار و دلسۆزی دەگۆرێت بۆ هۆشیاری گشتی لە پێگەی جەماوەر و خەلکدا. بۆیە زیرەکی زمان لە دەربرینی شاراوەی ناوەرۆکی ووشە و رووداوەکان کەدەبێتە زریزەی بەیەکبەستنەوەی رووداوەکان جوانیەك دەئافرێنێت لە رۆمان و چیرۆك و هۆنراو و رەخنەی ئەدەبی لە پاشاخانەی ئەدەبیاتی کلاسیك بۆ نوێبوونەوەی لە چاخی ژمارەیدا.

**نەتەوە :** قەبارەی دیاریکراوی دانیشتوانی کورد لە ناوەخۆی باشوور و هاوشانی کوردستانی گەورەیە کە پێکهاتەی کلتور و زمان و خاکە لە چوارچێوەی ئاشتی و جەنگدا کە کرۆکی گەردیلەی بەریەککەوتنی لەناوەخۆ و دەرکی یاری مانەوە بەرگریدەکات بەناوی نەتەوەی کورد بەلام ناسنامەی شێواوە بەهۆی هێزی ئقلیمی و زلهێزان هیچ دەرفەتی سەربەخۆی نەدراوە بەشەقام بۆئەوەی لەهەوێنی خاکی مێنەی لەدایکبێت بەلکو هۆکاری دەستپێشخەری ناوەخۆی لە خێزان و تیرە و عەشیرت و پێگەی دەرفەتەکان بەلارێدراون بۆ هێشتنەوەی دەسەلاتی دەرەکی و ئقلیمی بەرێگاری سیاسەتی نوێنەرایەتی ناوەخۆی دژ بە لەدایکبوونی شۆرەشێکی پەتی لە خاکی باشوور و کوردستانی گەورە، کەواتە گێرانەوەی مێژوو لەگەل رووداوی رۆژانە دەبێتە سێیەم سووتەمەنی بۆ پیتاندنی چەکی ناوەخۆی ئەدەبی لە مێژووی زمان و خاك و نەتەوەی کوردا.

**پیتاندنی چەکی ناوەکی لە ئەدەبیاتی کوردا...**

کاتێك شۆڕەشی ستووننووسی وەك شۆڕەشێکی نوێ لە ئەدەبیاتی میدیای ئەمەریکا و خۆرئاوا بەرپابوو بەرێگای نووسەرانی سەربەخۆ و پیشەی لە گۆڤار و رۆژنامەکان بەرێگای درێژنووسین و گەرانەوە بۆ مێژوو و تێکەلکردنی لەگەڵ رووداوی رۆژ کارنامەیەك بوو بۆ لەناوبردنی رۆمانی درێژ و کورت بەهۆکاری بلاوکراوەی رۆژانەوە و هەفتانە کە بەرکەوتنی خوێنەر بەهۆی بلاوکراوەکان جۆرێك لە هاوسەنگی دامەزراند لە نێوان هەوال و رووداوەکان تێکەل بە نەخشاندنی پەری گۆڤار و رۆژنامەی رۆژانەو هەفتانە و مانگانە زۆرترین کاریگەری دلسۆزی و رەفتاری خوێنەری بەرەو ئاراستەی شاراوە و لەناوبردنی خوێنەری چاخی کلاسیك و نوێ کە بۆ دووركەوتنەوە لە ناوەرۆکی رووداوەکان بەهۆی رەوانبێژی و گێرانەوەی رووداوەکان لەناوەخۆی دەقی رۆمانەکان بەرێگای کارێکتەرێکی رۆل گێراو لە ناو مێژوو و پێگەی میدیای لە ژیاردا دەبێتە ستوونی راگری کلتوری سێیەم کە رۆح و مێشك ئاودەدات بۆ نوێبوونەوەی هەلەی لەدایکبوونی پیتاندنی پێشهاتەکانی چەکی ناوەکی ئەدەبی کوردی.

ئەگەر شۆڕەشی ئەصفەهان نصف جیهان لەرووی شارستانی و ناوەراستی جوانی میراتی داهێنەری مۆرڤایەتی سەرزەوییێت ئەوا چەکی ناوەکی لە سنووری ئەدەبیاتی کوردستانی باشوور تەواوکەری هەلسانی لافاوی تەقینەوەی ئەم ئۆتۆنۆمیە شاراوەیە کەلەناوەخۆی رۆح و هزر و جەستەی خوێنەرانی ئەم پیشەسازیە هزریە ئەدەبیە لەدایك دەبێت رێرەوی خۆی دەگرێت بێ ئەوەی نووسەران حەجە لە خوێنەر بکەن و بۆ بازاری رۆشنفکران رێرەوی بگرێت ئەم خوێنەرە خۆرسکە بەلکو دەبێتە هەلوەشاندنەوەی رەختەی پەتی لە دەقەی رۆمان و چیرۆك و هۆنراوە و رەخنەی ئەدەبی و شانۆ، بەیەك قۆل شەپۆلی تەقینەوەی چەکی ناوەکی دەبێتە پاکتاوی جیهانی کۆمەنیستی نوێ و نیولیبرال کاپیتالیستی و دیموکراسی و رژێمی و هیپۆکراسی هی تر، واتە هەلوشاندنەوەی گرێبەستی کۆمەلایەتی و کەرتی تایبەت و گشتی لەناوەخۆی جیهاندا لەم کاتە قۆناغی ریفۆرمی برسیەتی و جەنگ و ئاشتی لە چوارچێوەی گەلانی هەرێم و دەولەت هەموو گۆشەکان دەرووخێنێت و دەگەرێتەوە سروشتی خۆی.

شەپۆلی چەکی ئەتۆمی لە ئەدەبیاتی کوردی پێویستی بە پیتاندنی ووردی هەیە بۆ ئەوەی کاریگەری لە ئالوگۆری کلتوری و دەقە رۆمانەکانی کوردی لەناوەخۆی ئقلیمی و جیهانی کاریگەری گۆرینی بالی گشتی پێکهاتەی کۆمەلگای پیشەسازی و ئابووری بەکاربەر و ولاتانی سێیەم لە ریشەوە بگۆرێت وەك یەکگرتنی پەرتەوازی ئەم چەکە ئەتۆمیە بتەقێتەوە واتە بالی وەرگێرانی ئەدەبیاتی کوردی لە کیشوەری ئەفریقا کاریگەری هەبێت بۆ پەرینەوە لەناوەخۆ بۆ 360 پلەی جیهانگیریدا.

ئەم چەکە ناوەکیە بەرێگای دارشتنەوە ناوەرۆکی ئەدەبیاتی نوێ لە چاخی دیجیتالی لەسەر پەری کاغەز بەهۆی بەرکەوتنی پەرتووك و ناوەرۆکی ئەدەبیات لە هەست و دلسۆزی و رەفتاری کاریگەری ئەرێنی دەبێت بۆ گۆرینی هزری کراوەی دوور لە توندوتیژ و رەگەزپەرستی بەلکو بازنەی پەرتەوازەی یەکگرتنی جیهانگیرییێت لە شۆڕەشی شەقام و کۆلان و دێهات و شار و هەرێم و وەلاتدا، ئەم ناوەرۆکە ئەتۆمیە لە جیهانی ئولترامۆدێرن رۆح خۆش دەکات و هزر کراوەدەبێت و خوێن دەکولێنێت لە بەیەکگەیشتنی خوێنەر و ناوەرۆکی ئەدەبی لە ئالوگۆری کلتوری و نێونەتەوەیدا.

ستوونی پیتاندنی چەکی ناوەکی لە ئەدەبیاتی کوردی پێویستی بەوە هەیە رۆژانە لەگەل رووداوەکان خۆی تۆماربکات بەرێگای هۆرنراوە و شانۆ و چیرۆك و رۆمان و رەخنەی ئەدەبی بەهاوکاری نوسەران و خوێنەران لەگەل ستوونی کلتور وەك مادە و مرۆڤ لە تەواوکەری ستوونی دووەمی کلتور کە دامەزراوەی گشتی حکومەت و سێکتەری مەدەنیە دەبێتە رۆح پێدانی رۆشنبیری لە ستوونی سێیەم بۆ تەقینەوەی چەکی ناوەکی لە ئەدەبیاتی کوردی بەهاوبەشی ئقلیمی و جیهانی، زەوی نوێدەبێتەوە لە پۆخلەواتی سیاسی و ئابووری و دادگەری و سەربازی و زانستی و مێژووی هی تر.

ئەم دەسکەوتە ئەتۆمیە بۆ ئەوەی کورد رزگارییێت لە دەسەلاتی سێبەر و داگیرکاری ناوەخۆی و ئقلیمی و ئیمپریالیزمی کە خۆریفۆرمرکردنی پێگەی باشوورە لە تەواوکەری جیهاندا لە سەدەی داهاتوو و جەنگی ئالۆزی دیجیتالی و کارنامەی تێکچوونی ژینگەی و جەنگ و برسیەتی و بێکاری و گەورەبوونی قەبارەی مرۆڤ لەسەرزەویدا. بۆیە گرینگی ئەم چەکە ئەدەبیە راستی رووداوەکان تۆماردەکات کە بەرێگای قەلەم کوتان و دۆلار ئەم مێژووە دامەزراوە بەلام نوێبوونەوەی ئەدەبی کوردی لە چەکی ناوەکی خاکی باشوور لە تێگەیشتنی کۆمەلەی گەلان بۆیان روونتردەبێت کە کرۆکی باشوور چی یەوە لە کوێیە بۆچ ئەم کارەساتە ئەدەبیە تەقیەوە لەناوەخۆی باشوور بەرووی جیهاندا. لێرە مێژوو و رووداوەکانی رۆژ تۆماردەکرێت و لەهەمان کات خۆی بەجیهان دەناسێنێت و کۆمەلگای کوردی لەگەل خۆی ریفۆرم دەکاتەوە لە پیتاندنی لەسەرخۆ لە چەکی ناوەکی ئەدەبیاتی کوردیدا.